د. گۆران عبدالله

# بۆچی تووشی کۆلێرا بووین؟

## هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە کوردستان لە ساڵی ٢٠١٢دا و سەرەتاکانی چارەسەر





ناوی کتێب: بۆچی تووشی کۆلێرا بووین؟
ناوی نووسەر: د. گۆران عبدالله
بابەت: تەندروستی
دیزاین: دانا حەسەن
نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠١٥
چاپخانە:پەنجەرە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٤٤١)ـی ساڵی (٢٠١٥)ـی پێدراوە.

# ناوەڕۆک

# دەربارەی نووسەر

د.گۆران عبدالله

پزیشـک و ماسـتەر لەسیاسـەتی تەندروسـتیی. لـە ١٩٧٨ لەکفـری لەدایکبـووە. سـاڵی ٢٠٠٣ کۆلێـژی پزیشـکی لـە زانکـۆی سـەلاحەددین لـە هەولێـر تـەواو کـردووە. لـە٢٠٠٧ لەڕێـی زەماڵـەی فولبرایتـەوە ماسـتەری لەسیاسـەتی تەندروسـتی لـە ئەمەریـکا تەواوکـردووە. لەمـاوەی خوێندنەکەیـدا چەندیـن خەڵاتـی پێبەخشـراوە وەک خەڵاتـی"The Eugene J.Gangrosa Award" گـانگرۆزا بـۆ باشـترین خزمـەت بـۆ تەندروسـتی جیهانیـی «وخـەڵاتـی (The Campus Life Trailblazer Awar) ترەیلبلەیـزەر بـۆ پێکـەوە ژیـان» لەزانکـۆی ئیمـۆری. پێـش هاتنـەوەی بـۆ کوردسـتان، لەبەشی تەندروستیی سـەنتەری کارتـەر کاریکـردووە، کـە سـەرۆکی پێشـووی ئەمەریـکا جیمـی کارتـەر بەڕێـوەی دەبـات.

لـە سـاڵی ٢٠٠٩ەوە بەڕێوەبـەری پرۆژەیـە لـە ڕێکخـراوی هارتلانـد ئەلایانسـی نێودەوڵەتـی بـۆ پێداویسـتیە مرۆییـەکان و مافەکانـی مـرۆڤ و لەگـەڵ زانکـۆی جۆنـز هۆپکنـزی ئەمریکـی یەکەمیـن توێژینـەوەی زانسـتی لـە بـواری دەروونـدروسـتی قوربانیانـی ئەشـکەنجە لـە کوردسـتان و عێـراق ئەنجامـدا. کاندیـدی دکتۆرایـە لـە زانکـۆی ئەدەنبـرە لـە بریتانیـا و سـکرتێری گروپـی کوردسـتانە لـە پەرلەمانـی سـکۆتلاندا.

# پێشەکی

لە پایزی ساڵی ٢٠١٢دا، بۆ جارێکی تر کوردستان کەوتە ژێر مەترسی و هەڕەشەی کۆلێرا. بە گوێرەی ئامارە فەرمییەکان، لەم پەتایەدا ٢٩٤ کەس تووشی نەخۆشیەکە بوون و ژمارەیەکی تری هاوڵاتیان گیانیان لەدەستدا. ئەمە یەکەمین جار نیە کە پەتای کۆلێرا لە کوردستان بە گشتی و لەسنووری پارێزگا و شاری سلێمانی بە تایبەتی بڵاودەبێتەوە، بەڵکو لە ساڵانی رابوردوودا و بە تایبەتی لە دەرئەنجامی ئابڵوقە ئابووریەکان و شەڕە ناوچەیی و ناوخۆیەکان و دواتریش بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و ناکارامایی و داڕوخانی سیستمی تەندروستیی، هەر چەند ساڵ جارێک کۆلێرا جارێکی تر سەرهەڵدەداتەوە.

ئەم نامیلکەیە هەوڵی ئەوە دەدات کە گفتگۆیەکی زانستی لەسەر هۆکارەکانی سەرهەڵدان و تەشەنەکردنی کۆلێرا لە کوردستاندا دەستپێبکات. پاڵنەری سەرەکی ئاوەها کارێک لەو هەژاریەوە هاتووە کە لە ناوەندە زانستی و ئاکادیمیەکانی هەرێمی کوردستاندا بەدیدەکرێت لەسەر گرفتە تەندروستیی و پزیشکیەکانی کۆمەڵگاکەمان. ناوەندە زانستی و زانکۆییەکانی هەرێمی کوردستان تاوەکو ئێستا نەیانتوانیوە بچووکترین توێژینەوە لەسەر ئەو گرفت و نەخۆشی و دەرد و کارەساتە تەندروستییانە بکەن کە ڕووبەڕووی هاوڵاتیان و کۆمەڵگا دەبێتەوە. لە دەرئەنجامدا ئەو کێشە و نەهاماتیانە ساڵ دوای ساڵ دووبارە و چەندبارە

دەبنــەوە و کارەســاتی گەورەتــر و ئاڵۆزتــر بــەدوای خۆیانــدا دەهێنــن.

مەبەســتێکی تــری ئــەم نامیلکەیــە هەوڵدانــە بــۆ تیشکخســتنە ســەر ئــەو سیاســەت و پــلان و ســتراتیژ و بەرنامانــەی کــە پێویســتە هەبــن بــۆ ڕووبەڕووبوونــەوە و بنبڕکردنــی کۆلێــرا لــە کوردســتاندا. هەرچەنــدە ناوەڕۆکــی ئــەم نامێلکەیــە زیاتــر تیشــکدەخاتە ســەر هۆکارەکانــی بڵاوبوونــەوەی پەتاکــە، بــەڵام لــە بەشــەکانی کۆتاییــدا هەوڵــدراوە هێڵــە گشــتیەکانی چارەســەری ئــەم پەتایــە و ســنووردارکردنی لــە داهاتــوودا بکێشــین. ئــەو هەوڵــە جیاوازییەکــی بنەڕەتــی هەیــە لــەو مۆدێلــە بــاوەی کــە لــە هەرێمــی کوردســتاندا بــۆ ڕووبەڕووبوونــەوە و ســنووردارکردنی نەخۆشــیی و پەتــا گواســتراوەکان دەدرێــت. مۆدێلــی بــاو لــە کوردســتاندا مۆدێلێکــی پزیشــکیی تەســکە کــە شکســتی هێنــاوە لــەوەی کــە هەمــوو فاکتــەر و هــۆکار و ڕێگاخۆشــکەرەکانی تریــش بخاتــە بەرچــاو کــە پەیوەندیەکــی ڕاســتەوخۆیان بــە پزیشــکیەوە نیــە، وەکــو فاکتــەر و هــۆکارە سیاســی و ئابــوری و کۆمەڵایەتــی و کەلتوریــەکان. لەمــەدا، نامیلکەکــە هەوڵــی ئــەوە دەدات کــە لــە پرنســیپەکانی زانســتی سیاســەتی تەندروســتییەوە کۆمەڵێــک ئامــراز وەربگرێــت بۆ کێشــانی وێنەیەکــی گشــتگیرتر بــۆ کێشــەی بڵاوبوونــەوەی کۆلێــرا و چۆنیەتــی بنبڕکردنــی لــە کوردســتاندا.

نامیلکەکــە لــە پێنــج بەشــی ســەرەکی پێکهاتــووە. بەشــی یەکــەم تیشــکدەخاتە ســەر لایەنــە پزیشــکییەکانی نەخۆشــیی کۆلێــرا. لــەم بەشــەدا هــۆکاری نەخۆشــیی کۆلێــرا (کــە بەکتیریــای کۆلێرایــە) باسدەکەین و لایەنــە بایۆلۆژیەکانــی دەخەینــەڕوو. هەروەهــا لەم بەشــەدا هۆکارەکانی ســەرهەڵدانی نیشــانەکانی نەخۆشــیەکە و چۆنیەتــی دەستنیشــانکردنی و دواتــر چۆنیەتــی چارەســەرکردن و خۆپاراســتن لێــی دەخەینــە ڕوو.

لــە بەشــی دووەمــدا، گەشــتێک بــە مێــژووی کۆلێــرا لــە جیهــان و عێراقــدا

دەکەین و جومگە سەرەکییەکانی مێژووی ئەم نەخۆشیە باس دەکەین. لەم بەشەدا باسی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی نەخۆشیەکە و سەرچاوەکانی ناوی نەخۆشیەکە و ناوهێنان و گێڕانەوەی نەخۆشیەکە لەسەرچاوە مێژوویە کۆنەکاندا دەکەین. هەروەها باسی پانەتا و سەرهەڵدانی کۆلێرا لە میانی ئەم پانەتایانە دەکەین. دەبێت ئەوە بڵێین کە دەستەواژەی پانەتا بۆ یەکەم جارە لە زمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێت و لە بەشی دووەمدا تیشکدەخەینە سەر دەستەواژەکە و پێویستی ئەو دەستەواژەیە بۆ زمانی کوردی و دەوڵەمەندکردنی زمانەکە لە ڕووی زانستی پزیشکیی و تەندروستییەوە. کێشەی سەرەکی ئەم بەشە کەمیی و هەژاریی ئەو سەرچاوانەیە کە باسی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا دەکەن لە کوردستاندا، چی لە ڕابووردووی کۆن و تازەدا. بۆیە گرنگی ئەم نامیلکەیە تەنها بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە دەیەوێت بەشێوەیەکی زانستی لێکۆڵینەوە لەم پەتایە بکات، بەڵکو ئەوەندەی نووسەری نامیلکەکە ئاگاداربێت ئەمە بۆ یەکەم جارە کە بە نووسین باسی نەخۆشی کۆلێرا دەکرێت لە کوردستاندا.

بەشی سێیەمی نامیلکەکە تایبەتە بە بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە پارێزگا و شاری سلێمانی لە پایزی ساڵی ٢٠١٢دا. لەو بەشدا بە وردیی و لەڕێی بەکارهێنانی ژمارە و داتاوە باسی پەتاکە دەکەین و تیشکدەخەینە سەر لایەنە جیاجیاکانی. لە بەشی سێیەمدا، ژمارەی ئەو هاوڵاتیانە دەخەینە ڕوو کە تووشی نەخۆشیەکە بوون و دابەشبوونی تووشبووان بەگوێرەی تەمەن و ڕەگەز و شوێنی کار و سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە و شوێنی دانیشتن دیاریدەکەین. ئەم ژمارە و لێکۆلێنەوانە تەنها گرنگ نین بۆئەوەی بەرچاوڕوونی گشتیمان لەسەر پەتاکە پێ ببەخشن، بەڵکو هاوکات گرنگیی خۆیان هەیە بۆ دارشتنی پلان و بەرنامە و پرۆگرامی تۆکمە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پەتاکە. بۆ نموونە یەکێک لە دۆزینەوە هەرە گرنگەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوەیە کە ئاوی ماڵان سەرچاوەی سەرەکی

بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـیەکەیە کـە ئەمـەش پێچەوانـەی ئـەو زانیاریانەیـە کـە حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان و وەزارەتـی تەندروسـتیی لەسـەر هـۆکاری بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـیەکە دەیانخسـتە بەرچـاو. بۆیـە ئەمـەش کاریگـەری هەیـە لەسـەر ئـەو میکانیـزم و هەنگاوانـەی کـە دەبێـت بگیرێتـە بـەر بـۆ سـنووردار کـردن و بنبڕکردنـی پەتاکـە.

لەبەشـی چوارمـدا، بـە درێژیـی باسـی هۆکارەکانـی بڵاوبوونـەوەی پەتاکـە دەکەیـن و تیشـک دەخەیەنـە سـەر ئـەو هۆکارانـەی کـە پەیوەندییـان بـە لایەنـە بایلۆژیەکانـەوە هەیـە و ئەوانـەی کـە پەیوەندییـان بـە لایەنـی سیاسـەت و سیسـتمی تەندروسـتییەوە هەیـە. لـە لایەنـە بایلۆژێکەیـەوە، قسـە لەسـەر ئـەو لایەنانـە دەکەیـن کـە پەیوەندییـان بـە ئـاوی پاکـی خواردنـەوەوە هەیـە و پیسـبوونی سـەرچاوەکانی ئـاوی خواردنـەوە وەکـو هـۆکاری سـەرەکی بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـیەکە. بـەڵام چونکـە کۆلێـرا تەنها بـە ئـاو و خواردنـی پیـس بڵاونابێتـەوە و پێویسـتی بـە زەمینەسـازی هەیـە بـۆ بڵاوبوونـەوەی و ئـەو زەمینەسـازییە پەیوەنـدی بـە سیسـتمی سیاسـی و ئابوریـی و کۆمەڵایەتیـەوە هەیـە، بۆیـە ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بـە شـارەزایی نووسـەری ئـەم نامێلکەیـەوە هەبێـت، قسـە لەسـەر سیسـتمی تەندروسـتیی دەکەیـن و لایەنـە سیاسـی و ئابووریـەکان بەجێدەهێڵیـن بـۆ کەسـانی پسـپۆر لـەو بوارانـەدا.

لـە بەشـی پێنجـەم و کۆتاییـدا بـە کورتیـی هێڵەگشـتیەکانی ئـەو دەرئەنجامانـە دەکێشـین کـە ئـەم نامیلکەیـە بەدەسـتیهێناوە و لەژێـر ڕۆشـنایی ئـەو دەرئەنجامانـە، چەنـد ڕاسـپاردەیەکی پراکتیکـی و سـادە دەخەینـە بـەردەم لایەنـە پەیوەندیـدارەکان.

خوێنـەری نامیلکەکـە دەتوانێت لایەنـە پۆزەتیـڤ و باشـەکانی ئـەم کارەی لـە میانـی خوێندنەوەیەکـی ڕەخنەگرانـەدا بـۆی دەرکەوێـت. بـەڵام ئێمـە

نامانەوێت لەم پێشەکیەدا قسە لەسەر ئەو لایەنانە بکەین، و ئەوانە بۆ خوێنەر خۆی بەجێدەهێڵین. ئەوەی گرنگە لێرەدا تیشکی بخەینە سەر، لایەنە نەگەتیڤ و کەموکورتیەکانی ئەم نامیلکەیەیە. سەرەتا کارێکی لەم قەبارەیە و پەیوەست بە نەخۆشیەکی کوشندەی وەکو کۆلێرا پێویستی بە هەماهەنگی و تیمێکی گەورەتر و شارەزاتر و بە ئەزموونتر هەیە بۆ ئەوەی مافی خۆی بداتێ. بۆیە ئەم نامیلکەیە ئەوەندەی سەرەتایەکە بۆ ئاوەها کارێکی فراوانتر و گشتگیرتر و تۆکمەتر، خۆی کۆتاکار نیە. هەروەها کێشەیەکی گەورەی نامێلکەکە ئەو کەموکورتیانەیە کە لەو داتا و ژمارانەدا بەدیدەکرێت کە نامێلکەکە بەکاریهێناون. ئەوەش کێشەیەکی گشتیی سیستمی تەندروستیی و تەنانەت تەواوی سیستمی کارگێڕی کوردستانە. بۆیە بڕوامان وابوو کە داتایەکی کەم و نوقستان لە نەبوونی تەواوەتی داتا باشترە و پێویستە بەوەی هەیە ڕازیبین و کاری لەسەر بکەین و هەوڵی ئەوە بدەین کە لە داهاتوودا هانی لایەنە پەیوەندیدارەکان بدەین کە داتا و ژمارەی تۆکمەتر و زانستیانەتر بخەنەڕوو.

لە کۆتاییدا سوپاسی ژمارەیەک هاوڕێ و هاوپیشە دەکەین کە ڕۆڵی باڵایان هەبوو لەوەی ئەم کارە ڕووناکی ببینێت. دەبێت سوپاسی زۆر بەڕێز د. عبدالفتاح هەورامی بکەم بۆ هاوکاری و پشتگیری و هەماهەنگی جەنابیان لە دابینکردنی کۆمەڵێک زانیاری و داتای گرنگ بۆ ئەم نامیلکەیە. هەروەها سوپاسی بەڕێزیان دەکەین بۆ ئامۆژگاریی و ڕێنماییە بەردەوامەکانی. تایبەت سوپاسی زۆر بەڕێز موزەفەر هەمزە ئەکەین بۆ پشتگیری جەنابیان و هەوڵە بەردەوامەکانیان بۆ تەواوکردنی ئەم کارە و هەستکردنی بە کەموکورتیەکانی کەرتی تەندورستی لە هەرێمی کوردستاندا هەورەها سوپاسی دەکەین بۆ ئامادەباشیان بۆ پێداچوونەوەی بە. سوپاسی هاوبەشی خۆشەویستی ژیانم (ئەڤین) دەکەم بۆ پشتگیری بەردەوامیی.

# کورتەی بەشی یەکەم

● کۆلیرا سکچوونێکی کتوپڕە، کە دەتوانێت لە ماوەی چەند کاژێرێکی کەمدا ببێتە هۆی لە دەستدانی بڕێکی زۆری شلەمەنی لەش و دواتر ئەگەر چارەسەر نەکرێت دەشێت نەخۆشەکە بکوژێت.

● سالآنە زیاتر لە ٣ ملیۆن مرۆڤ تووشی کۆلێرا دەبن لە جیهاندا.

● کۆلێرا لە وڵاتێک یا لە ناوچەیەک سەرهەڵدەدات کە گرفتی شەڕ و ئاژاوە و نائارامیی و گەندەڵی سیاسی هەبێت.

● بەکتیریای کۆلێرا پێی دەوترێت ڤایبرۆ کۆلێرا (Vibrio cholera) سەر بە سپیشیزێکە (Species)کە زیاتر لە ٢٠٠ سیرۆگروپی (Sero-group) هەیە.

● بەکتیریای کۆلێرا حەزی لە ئاوی سوێرە.

● مرۆڤ تەنها گیانلەبەرە کە کۆلێرا لە ناو لەشیدا گەشەدەکات.

● ژمارەیەکی کەمی بەکتیریای کۆلێرا، لەو کەسانەی کە دژە ترشی گەدە بەکاردەهێنن، بەسە بۆ تووشبوون بە پەتاکە.

● هەڵگری گروپی خوێنی O زیاتر و قورستر تووشی کۆلێرا دەبن و هەڵگری گروپی AB کەمتر و سووکتر.

● ئاوی خواردنەوەی پیس باوترین میکانیزمی گواستنەوەی کۆلێرایە.

● بەکتریای کۆلێرا ژەهرێک دروستدەکات و دەردەدات کە دەبێتە هۆی

سەرهەڵدانی نیشانەکانی نەخۆشیەکە لە کەسی تووشبوودا.

● دوای ٢٤-٤٨ کاژێر نیشانەکانی کۆلێرا دەردەکەوێت.

● ئەو نیشانەیەی کە زۆر باوە و کۆلێرای پێ دەناسرێتەوە دەسپێکردنی سکچوونێکی بێ ئازارە کە وەکو ئاو وایە و بە خێراییەکی ترسناک زیادەکات و زۆرتر دەبێت.

● لە زۆربەی حاڵەتەکانی کۆلێرادا، نەخۆشەکە تووشی تا و بەرزبوونەوەی پلەکانی گەرمی لەشی نابێت.

● بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە، لە پاڵ نیشانە کلینکیەکاندا، پێویستە بەکتیریای کۆلێرا لەژێر مایکرۆسکۆپ یا بە چاندن (زرع) ببینرێت و لە حاڵی حازردا شێوازی خێرا بۆ دەستنیشانکردنی بەکتیریاکە بەکاردەهێنرێت.

● خۆپاراستن لە کۆلێرا لەرێی ئاوی پاکی خواردنەوە و ئامادەکردنی خواردن بە شێوازێکی تەندروستەوە دەبێت. کۆمەڵێک ڤاکسین هەیە کە دەکرێت بەکاربهێنرێت.

● کۆلێرا لەرێی پێدانی شلەمەنی و ئاو و پۆتاسیۆم و ئەگەر پێویست بکات ئەنتیبایۆتیکەوە چارەسەر دەکرێت.

# نەخۆشی و بەکتیریای کۆلێرا



نەخۆشیی کۆلێرا سکچوونێکی کتوپڕە کە دەتوانێت لە ماوەی چەند کاژێرێکی کەمدا ببێتە هۆی لە دەستدانی بڕێکی زۆری شلەمەنی لەش و دواتر ئەگەر چارەسەر نەکرێت دەشێت نەخۆشەکە بکوژێت. (Harri-son 2012) خۆشبەختانە دەکرێت ئەوانەی تووشی کۆلێرا دەبن لە ڕێی پێدانی شلەمەنی و چارەسەری ترەوە کە لە خوارەوە باسیان دەکەین زوو چارەسەر بکرێن و لە مردن ڕزگاربکرێن.

بەکتیریای کۆلێرا لە ناوچەی گانگیزی نیمچە کیشوەری هیندەوە سەرچاوەی گرتووە (نەخشەی ژمارە١).




نەخشەی ژمارە ١

سێگۆشەی گانگیز

سەرچاوە: http://www.indianetzone.com/29/ganges_delta.htm

لە ساڵی ١٨١٧ەوە، حەوت جار کۆلێرا بە هەموو جیهاندا بڵاوبووەتەوە. حاڵی حازر جیهان بە پانەتای حەوتەمدا تێدەپەڕێ کە لە ساڵی ١٩٦١ لە ئەندەنوسیاوە دەستیپێکرد وبە هەموو ئاسیادا بڵاوبووەوە و تا ئێستاش بەردەوامە.

لە حەفتاکانی سەدەی ڕابووردوودا کۆلێرا بە ئەفریقیادا بڵاوبووەوە و پێش ئەوەی وەکو درمێکی درێژخایەن بڕەوێتەوە، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەفریقیای تووشکرد و لەناوبرد. نزیکەی ٩٠٪ هەموو ئەو نەخۆشانەی کە تووشی کۆلێرا دەبن یا لە ئەفریقیا یا لە ئاسیان. بەڵام ڕادەی تووشبوون بە نەخۆشیەکە بە وردی نازانرێت چونکە زۆرێک لەو وڵاتانەی کە درمەکەیان بە شێوەیەکی درێژخایەن هەیە، لای دەزگا پەیوەندیدارەکانی وەکو ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئاشکرای ناکەن.

هەندێک لە سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ساڵانە زیاتر لە ٣ ملیۆن مرۆڤ تووشی کۆلێرا دەبن لە جیهاندا بەڵام تەنها زانیاری لەسەر٢٠٠٠٠٠ نەخۆشی کۆلێرا بۆ ڕێکخراوێکی وەکو ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئاشکرا دەکرێت. هەروەها ساڵانە زیاتر لە ١٠٠،٠٠٠ کەس بە هۆی کۆلێراوە گیان لە دەستدەدەن، لە کاتێکدا ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی زانیاری تەنها لەسەر ٥٠٠٠ کەس هەیە کە ساڵانە بە هۆی نەخۆشیەکەوە گیان لە دەستدەدەن.

کەواتە کۆلێرا نەخۆشیەکی تازە نیە و بە بەردەوامی هەبووە لە جیهاندا بەتایبەتی لە ئەفریقیا و ئاسیا. بەڵام هەر ماوەی چەند ساڵێک جارێ وەکو درم سەرهەڵدەدات و ژمارەیەکی زۆری نەخۆش دەکاتە قوربانی.

گرافی ژمارە ١، ڕێژەی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە کیشوەرە جیاجیاکانی

جیهاندا پیشـاندەدات.

زۆربـەی جـارەکان کۆلێـرا لـە وڵاتێـک یـا لـە ناوچەیـەک سـەرهەڵدەدات کە دووچـاری گرفتـی شـەڕ و ئـاژاوە و نائارامیـی و گەندەڵـی سیاسـی بووبێـت١ .

بـۆ نموونـە کۆلێـرا لـە سـاڵی ١٩٩٤ لەنێـو پەناهەندەکانـی ڕوانـدا لـە کۆنگـۆ و زائیـر بڵاوبـووەوە و هەروەهـا لـە سـاڵی ٢٠٠٨-٢٠٠٩ بـە هـۆی ئـاژاوەی ناوخۆیـی لـە زیمبابـوی و لـە سـاڵی ٢٠١٠ بـە هـۆی بومەلـەرزەوە بڵاوبـووەوە.




گرافی ژمارە ١

ژمارەی نەخۆشەکانی کۆلێرا لە جیهاندا بە پێی ساڵ و کیشوەر

سەرچاوە: ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی

لە ساڵی ٢٠٠٥ بە دواوە، ژمارەی ئەوانەی تووشی کۆلێرا بوون لە جیهاندا بە شێوەیەکی گشتی زیادیکردووە. پەتای کۆلێرا لەو ساڵە بە دواوە لە چەند کیشوەرێکی جیا جیا تۆمارکراوە (WHO 2013a)). لە نێوان ساڵەکانی ٢٠٠١ و ٢٠٠٩دا، نزیکەی٩٣٪ بۆ ٩٨٪ی هەموو ئەوانەی تووشی کۆلێرا بوون لە ئەفریقیا نیشتەجێبوون. بەڵام لە ساڵی ٢٠١١دا، تەنها ٣٢٪ هەموو نەخۆشەکانی کۆلێرا نیشتەجێی ئەو کیشوەرە بوون. زیاتر لە ٦٠٪ نەخۆشەکانی کۆلێرا لە ساڵی ٢٠١١ لە ئەمریکای باشوور و بە تایبەتی لە هایتی تۆمارکراون.

بۆ نموونە وڵاتی هایتی یەکێکە لەو وڵاتانەی لە حاڵی حازردا بە شەپۆلێکی فراوانی تووشبوون بە کۆلێرا تێدەپەڕێت. لە ساڵی ٢٠١١دا زیاتر لە ٣٤٠٠٠٠ (سێ سەد و چل هەزار) کەس لەو وڵاتە تووشی کۆلێرا بوون (Guardian, 2012). بەو ژمارییەوە هایتی لە هەموو وڵاتی دنیا بەیەکەوە نەخۆشی کۆلێرای زیاتر بوو لە ساڵی ٢٠١١دا. تەنها لە ساڵی ٢٠١١دا، نزیکەی ٧٠٠٠ (حەوت هەزار) کەس بە کۆلێرا لە هایتی مردوون و لە ساڵی ٢٠١٢دا تا ئێستا کۆلێرا ٦٠٠ کەسی کوشتووە. جگە لە نائارامی سیاسی و دواکەوتوویی ئابوریی، هایتی تووشی کۆمەڵێک کارەساتی ژینگەیی بوو وەکو بومەلەرزە و بەم دواییانە تۆفانی ساندی کە هۆکارن بۆ بڵاوبوونەوەی کۆلێرا. بەڵام بە پێی زانیاریەکان، یەکێک لە هۆکارەکانی بڵاببوونەوەی کۆلێرا ئەو سەربازانەن کە وەکو بەشێک لە هێزەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان لەو وڵاتەدا دامەزراون. توێژینەوەکان دەریانخستووە کە ئەو جۆرە کۆلێرایەی کە لە هایتی بڵاوبووەتەوە هەمان جۆرە کە لە نیپاڵدا هەیە وسەربازە نیپالیەکانی هێزی نەتەوەیەکگرتووەکان بەوە تۆمەتباردەکرێن کە ئاوی ئەو جۆگەلە و ڕووبارانەیان پیسکردووە کە خەڵکی هایتی لێیاندەخۆنەوە و بۆ خۆ پاکردنەوە ومەلەکردن بەکاریدەهێنن(WHO 2013b)).

پەتایەکی تری کۆلێرا کە لە سیرالیۆن ڕوویدا بووە هۆی تووشبوونی دانیشتوانی دوانزە لە سیانزە پارێزگاکەی ئەو وڵاتە. تا سەرەتای مانگی دەی ٢٠١٢، (٢٠٧٣٦) کەس (بیست هەزار و حەوسەد و سی و شەش کەس) تووشی کۆلێرا بوون لەو وڵاتە و ٢٨٠ کەسی دیکەشی کردە قوبانی. ئەم ژمارە زۆرەی تووشبووان و قوربانیانی کۆلێرا لە وڵاتەکە وای لە سەرۆکی سیرالیۆن کرد کە بڵاوبونەوەی کۆلێرا لە وڵاتەکەی بە قەیرانێکی مرۆیی ناوببات و داوای یارمەتی لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان کرد بۆ کۆتایی هێنان بە پەتاکە (WHO 2013b). هەر لەم دواییانەدا، کۆلێرا لە کۆنگۆی دیموکراتی سەری هەڵدا و تا ناوەڕاستی مانگی دەی ٢٠١٢، ٥٢ کەسی تووشکردو بووە هۆی مردنی ٢٥ کەس.

لە پاڵ زیانە تەندروستییەکانی کۆلێرا، نەخۆشییەکە کۆمەڵێک زیانی ئابووری و تەنانەت سیاسیشی هەیە. یەکێک لەو توێژینەوە دەگمەنانەی کە کاری کردووە لەسەر کۆی تێچووە داراییەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی کۆلێرا و ئەو زیانە ئابووریانەی کە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکەوە دروستدەبن، پەردە لەسەر زیانێکی گەورە هەڵدەماڵن لە ئابوری ئەو وڵاتانەی کە تووشبوون (Kirigia et al 2009). توێژینەوەکە کاری لەسەر بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە وڵاتەکانی ئەفریقیادا دەکات. لە ساڵی ٢٠٠٧دا لە سەرانسەری جیهان ١٧٨٦٧٧ کەس تووشی کۆلێرا بوون و ٤٠٣٣ کەس لە ئەنجامدا گیانیان لە دەستدا. نزیکەی ٦٢٪ ئە کەسانەی تووشی کۆلێرا بوون نێشتەجێی یەکێک لە وڵاتە ئەفریقیایەکان بوون و ڕێژەی ٥٦.٧٪ ئەوانەی گیانیان لە دەستدا دیسان لە خەڵکی ئەفریقیا بوون. هەروەها لە ساڵی ٢٠٠٦ دا پەتاکە بڵاوبووەوە، بە پێی ئەو توێژینەوەی سەرەوە، نزیکەی ٩٢ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی زیانی لە ئابووری ئەو وڵاتانەدا کە نەخۆشییەکەی تێیدا بڵاوبووەوە.

## بەکتیریای کۆلێرا:

بەکتیریای کۆلێرا (وێنەی ژمارە ١) کە پێی دەوترێت ڤایبرۆ کۆلێرا (Vibro cholera) سەر بە سپیشیزێکە (Species) کە زیاتر لە ٢٠٠ سیرۆگروپی (Serogroup) هەیە. (Harrison 2012) تاوەکو ساڵی ١٩٩٢، سیرۆگروپی O1 گەورەترین هۆکاری پەتای کۆلێرا بوو لە جیهاندا. لەو ساڵەدا سیرۆگروپێکی تر دەستنیشانکرا و دۆزراوەیەوە کە سیرۆگروپی O139یە. سیروگروپی O1 بۆ سەر دوو جۆر بایۆتایپ (Biotype) پۆلێن دەکرێت کە کلاسیک و ئێل تورن. (Classical and El Tor)

هەر یەکێک لەو بایۆتایپەش دیسان دابەشدەکرێن بۆ سەر دوو سیروتایپ (Serotype) کە ئینابا و ئۆگاوان (Inaba and Ogawa).



وێنەی ژمارە ١

بە کتیریای کۆلێرا لە ژێر مایکرۆسکۆبی ئیلکترۆنی

سەرچاوە: مایکرۆبویکی

بەکتیریای کۆلێرا حەزی لە ئاوی سوێرە و لە نزیک دەریا و شوێنی ڕژانی ئاوی ڕووبارەکان لە دەریادا دەژی (Harrison,2012).

لەو شوێنانەدا، بەکتیریا کۆلێرا خۆی دەنووسێنیت بە گیانەوەرە بچووکەکانی ناو ئاوی سوێرەوە. مرۆڤ زۆربەی جارەکان بە ڕێکەوت تووشی بەکتیریای کۆلێرا دەبێت، بەڵام هەر کە تووشببێت یەکسەر دەبێتە ئامرازێکی خێرای گواستنەوەی نەخۆشیەکە بۆ کەسێکی تر. هەرچەندە بۆی هەیە کە بەکتیریای کۆلێرا خۆی بە ئاژەڵێکی بچووکەوە هەڵواسێت، بەڵام بەکتیریاکە لە ناو لەشی هیچ بوونەوەرێکی تر نامێنێتەوە و مرۆڤ تەنها گیانلەبەرە کە کۆلێرا لە ناو لەشیدا گەشەدەکات. ئەم ڕاستیە ڕەنگە یارمەتیدەر بێت بۆ ئەوەی بە دوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕێین کە هاوکاری بوونەوەرەکانی تر دەکەن لە بەرگریکردن لە تووشبوون بە کۆلێرا و دواجار بەکارهێنانی هەمان ئەو میکانیزمانەی کە بوونەوەرەکانی تر بەکاریدەهێنن بۆ بەرگریکردنی مرۆڤ لە نەخۆشییەکە.

بۆ ئەوەی کۆلێرا کەسێکی ئاسایی نەخۆش بخات، دەبێت ژمارەیەکی زۆری بەکتیریا بچێتە لەشی مرۆڤەکەوە (Harrison,2012)بەڵام لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراودا، ژمارەی ئەو بەکتیریایانەی کە پێویستن بۆ ئەوەی مرۆڤەکە تووشبکەن و نەخۆشی بخەن کەمترە. بۆ نموونە لەو حاڵەتانەی کە ترشی گەدە کەمدەبێتەوە یا بەهۆی نەخۆشیەکی دیاریکراوەوە، یاخود لە ڕێی بەکارهێنانی دژە ترشی گەدە (ئەنتیئەسد، زانتاک، تەگەمێت، ئۆمیپرازۆل... هتد) کەسەکە بە ژمارەیەکی کەمتری بەکتیریا بۆی هەیە تووشی کۆلێرا ببێت. هەروەها کاتێک ترشی گەدە لە ڕێی خواردنی ئاساییەوە لاوازدەبێت، لەو کاتەدا بەکتریای کۆلێرا چالاکترە و بە ژمارەیەکی کەمتر دەتوانێت کەسەکە تووشی نەخۆشیەکە بکات. بۆیە بەکارهێنانی بێ ئەندازەی دژە ترش لە لایەن هاوڵاتیانەوە ڕەنگە یەکێک

بێت لە هۆکارەکانی زوو بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە کوردستاندا.

لەو شوێن و ناوچانەی کە کۆلێرا بە بەردەوامی بوونی هەیە، منداڵان زۆربەی ئەوانە پێکدەهێنن کە تووشی نەخۆشیەکە دەبن (مەرج نیە هەموو کەسێک کە بەکتیریاکە بچێتە لەشیەوە تووشی نەخۆشیی کۆلێرا ببێت). بەڵام لەو شوێنانەی کە کۆلێرا وەکو درم و پەتا بڵاودەبێتەوە جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوان تەمەنەکاندا نیە و بەکتیریاکە گەورە و بچووک وەکو یەک نەخۆش دەخات. (Harrison,2012)

کۆلێرا زیاتر لەو وەرزانەدا ڕوودەدات کە پلەکانی گەرمی بەرزدەبنەوە و بارانێکی زۆر دەبارێت و لافاو ڕوودەدات بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە بەکتیریاکە بە بەردەامی بوونی هەیە. لەو شوێنانە، وەرزەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا پێیان دەوترێت «وەرزی کۆلێرا» (Harrison,2012).

بە هۆی کۆمەڵە هۆکارێکەوە کە تاوەکو ئیستا نازانرێت چین، گروپی خوێن کاریگەری هەیە لەسەر ڕادە و قورسیی تووشبوون بە کۆلێرا. بۆ نموونە ئەوانەی کە گروپی خوێنیان O یە زیاتر لە گروپەکانی تر ئەگەری تووشبوونیان بە کۆلێرا هەیە و ئەگەریش تووشببن ئەوا بە قورسیی و خەستی نەخۆشیەکە دەگرن. هاوکات ئەوانەی کە گروپی خوێنیان AB ە کەمتر لە گروپەکانی تر ئەگەری تووشبوونیان بە نەخۆشیەکە هەیە و کە تووشیشبن ئەوا نەخۆشیەکە لای ئەوان سووکترە. (Harrison,2012)

# نەخۆشی کۆلیرا

## شێوازەکانی گواستنەوە:

کۆلێرا لە ڕێی خواردنەوەی ئاوێکەوە دەگوازرێتەوە کە بە پیسایی مرۆڤێک پیسبووبێت کە تووشی کۆلێرا بووبووێت. ئاوی خواردنەوەی پیس باوترین میکانیزمی گواستنەوەی کۆلێرایە (Harrison,2012). هەروەها خواردنی خواردەمەنی پیسبوو بە بەکتیریاکە یەکێکی ترە لە ڕێگاکانی گواستنەوەی کۆلێرا.

## میکانیزمەکانی دروستبوونی نەخۆشی:

بەکتریای کۆلێرا ژەهرێک دروستدەکات و دەردەدات کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نیشانەکانی نەخۆشیەکە لە کەسی تووشبوودا. ژەهری کۆلێرا بە تایبەتی لەسەر ڕیخۆڵە باریکە کاردەکات. ژەهری کۆلێرا دوو پێکهاتەی هەیە کە پێیان دەوترێن پێکهاتەی (ا) و پێکهاتەی (ب). پێکهاتەی (ب) دەنووسێت بە خانەکانی ڕیخۆڵە باریکەوە و بوار بۆ پێکهاتەی (ا) دروستدەکات بۆ ئەوەی بچێتە ناو خانەکانەوە. ئەو پێکهاتەیەی کە دەچێتە ناو خانەکانەوە دوو ئەرکی گرنگی

هەیە بۆ دروستکردنی نیشانەکانی نەخۆشی کۆلێرا. ئەو پێکهاتەیە لە لایەکەوە مژینی سۆدیۆم لە ڕیخۆڵە باریکە کەمدەکاتەوە و لە لایەکی تریشەوە دەرکردنی کلۆر زیادەکات. بەو جۆرە کلۆرایدی سۆدیۆم لەناو ڕیخۆڵەکاندا کۆدەبێتەوە. ئەمەی دوایی لە بنەڕەتدا خوێیە و ئاو بۆ خۆی ڕادەکێشێت و بۆیە ئاو و شلەمەنی لە ناو ڕیخۆڵەکاندا کۆدەبێتەوە. کاتێک کە بڕی ئەو ئاو و شلەمەنیە لە توانای ڕیخۆڵەکان بۆ هەڵمەژینیان زیاتر دەبێت سکچوونێکی زۆر ڕوودەدات. ئەگەر ئەو ئاو و شلەمەنیە بە خێرایی نەدرێتەوە نەخۆشەکە و جێگای ئاو و شلەمەنیە لە دەستچووکە نەگرێتەوە ئەوا نەخۆشەکە تووشی شۆک دەبێت. هاوکات نەخۆشەکە تووشی بەرزبوونی ترشیی لەش دەبێت. ئەم نیشانەی دوایی لە ئەنجامی لە دەستدانی ئاو و شلەمەنی لەشی نەخۆشەکەوە ڕوودەدات. ئەمەش بۆ خۆی دەبێتە هۆی ‹خەستبوونی› خوێنی نەخۆشەکە و زیادبوونی ڕێژەی خوێکان لە لەشیدا.

## نیشانەکان:

نەخۆشی کۆلێرا کۆمەڵێک نیشانەی هەیە کە لە نەخۆشێکەوە بۆ نەخۆشێکی تر دەگۆڕێت. هەندێک لەوانەی کە تووشی کۆلێرا دەبن هیچ نیشانەکیان نابێت یا بە تەنها تووشی سکچوونێکی کەم دەبن. بەڵام ژمارەیەکی تری نەخۆشەکان تووشی سکچوونێکی لە ناکاو و زۆر دەبن و ڕەنگە ژیانیان بکەوێتە مەترسیەوە (Harrison,2012). تاوەکو ئێستا ئەوە نەزانراوە ئاخۆ بۆچی نیشانەکانی کۆلێرا لە نەخۆشێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت. بەڵام ژمارەیەک فاکتەر ڕەنگە ڕۆڵیان هەبێت لە جیاوازی نیشانەکان. بۆ نموونە ڕەنگە ئاستی بەرگری لەشی

نەخۆشەکە و گروپی خوێن و باشی یا خراپی خواردنی، ڕۆڵی گەورە ببینن لەوەی کە نەخۆشەکە بە قورسی تووشی کۆلێرا دەبێت یاخود بە سووکی.

لەو کەسانەی کە هیچ بەرگریەکیان بۆ کۆلێرا نیە و پێشتر بەکتیریاکە نەچووبێتە لەشیانەوە، دوای ٢٤ -٤٨ کاژێر نیشانەکانی کۆلێرایان تێدا دەردەکەوێت. ئەو نیشانەیەی کە زۆر باوە و کۆلێرای پێ دەناسرێتەوە دەسپێکردنی سکچوونێکی بێ ئازارە کە وەکو ئاو وایە و بە خێراییەکی ترسناک زیادەکات و زۆرتر دەبێت. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا نەخۆشەکە دەرشێتەوە. لە حاڵەتە زۆر قورسەکاندا، نەخۆشەکە بۆ هەر کیلۆگرامێکی لەشی خۆی ٢٥٠ سیسی شلەمەنی لە کاژێری یەکەمدا لەدەستدەدات. ئەگەر ئەو شلەمەنیی و خوێیەیی کە لە ڕێی سکچوون و ڕشانەوەوە لە دەستدەچن هەر زوو لەڕێی (مغذی) یەوە نەدرێنەوە نەخۆشەکە، ئەوە دوای ماوەیەکی کەم تووشی شۆک دەبێت و ڕەنگە گیان لە دەستبدات. لە زۆربەی حاڵەتەکانی کۆلێرادا، نەخۆشەکە تووشی تا و بەرزبوونەوەی پلەکانی گەرمی لەشی نابێت.

پیسایی ئەو نەخۆشەی تووشی کۆلێرا دەبێت دەرکەوتێکی تایبەتی هەیە. پیساییەکە وەکو ئاوێکی سپی تەڵخ وایە کە پارچەی بەڵغی تیایە بەڵام خوێن و کێمی تیا نیە. بۆنی پیسایی نەخۆشی کۆلێرا زۆر پیس و ناخۆش نیە بەڵام بۆنێکی تایبەتی هەیە کە نزیکە لە بۆنی ساردییەوە. زۆر جار پیسایی نەخۆشی کۆلێرا بە ئاوی برنج دەشوبهێنرێت چونکە شکلی سکچوون و پیساییەکە لەو ئاوە دەچێت کە دوای شتنی برنج دەمێنێتەوە (وێنەی ژمارە ٢).



Source: Longo DL, Fauci AS, Kasper DL, Hauser SL, Jameson JL, Loscalzo J: *Harrison's Principles of Internal Medicine*, 18th Edition: www.accessmedicine.com



وێنەی ژمارە ٢

وێنەی پیسایی کۆلێرا

سەرچاوە: هاریسون

نیشانەکانی کۆلێرا پەیوەستە بە ڕێژەی ئەو ئاو و شلەمەنیەی کە نەخۆشەکە لە دەستی دەدات. بۆ نموونە کە کەمتر لە ٥٪ی کێشی لەش لە دەستدەچێت، نەخۆشەکە تووشی تینوێتی دەبێت. ئەگەر لەدەستچوونەکە ٥-١٠٪ی کێشی لەش بوو ئەوکات نەخۆشەکە تووشی سەرسوڕان و دابەزینی فشاری خوێن و بێ هێزی و خێرا لێدانی دڵ و وشکبوونی پێستی دەبێت. ئەگەر هاتوو زیاتر لە ١٠٪ی کێشی لەشی نەخۆشەکە لەدەستبچێت ئەوا گورچیلەکان کەمتر میز دروستدەکەن

و چاوەکانی نەخۆشەکە دەچێتە قوڵایی و پێستی نەخۆشەکە چرچ دەبێتەوە و نەخۆشەکە هەست بە ماندووبوون و خەواڵوویی دەکات و لە کۆتاییشدا هۆشی خۆی لە دەستدەدات.

خێرایی ئەو نیشانانەی سەرەوە و ئەگەری مردنی نەخۆشەکە بە هۆی بەکتیریای کۆلێراوە، وای کردووە کە ئەمەی دوایی بە یەکێک لە خێراترین بکوژەکانی دنیای پزیشکیی بناسرێت (Dick et al 2012). بەڵام لە پاڵ ئەوەی کە کۆلێرا دەتوانێت بە خێرایی قوربانیەکەی بکوژێت، خۆشبەختانە هاوکات چارەسەری نەخۆشیەکە ئاسانە و تەنها لەڕێی گەڕاندنەوەی ئەو ئاو و شلەمەنییەی کە نەخۆشەکە بەهۆی سکچوونەوە لە دەستیدەدات، ژیانی نەخۆشەکە لە مردن ڕزگاری دەبێت. بۆیە دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە و دواتر فەراهەمکردنی چارەسەری خێرا و کاریگەر دوو هەنگاوی زۆر گرنگی کۆنترۆڵکردنی کۆلێران. لە خوارەوە باسی شێوازەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە دەکەین و دواتریش قسە لەسەر چارەسەر دەکەین.

## دەستنیشانکردن:

کۆلێرا لەڕێی پشکنینی تاقیگەوە دەدۆزرێتەوە. ئەگەر هاتو گومانی کۆلێرا کرا لەو نیشانانە کە لە نەخۆشدا دەردەکەون، ئەوا دەبێت بە زووترین کات پشکنین بۆ پیسایی نەخۆشەکە بکرێ. (Harrison,2013) نموونەی پیساییەکەی نەخۆش لە ژێر مایکرۆسکۆبدا بەو شێوازەی پێی دەگوترێت

(Dark Field Microscopy) دەپشکنرێت و بەم شێوازە دەکرێت بەکتیریای کۆلێرا ببینرێت.

باشتر وایە کە ئەو نموونەیەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە نموونەیەکی تازە بێت و کاتی بەسەردا تێنەپەڕیبێت. هەروەها نموونەی پیساییەکە دەبێت لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بکرێت. ئەم شێوازەی پشکنین کە نموونەکە لە گەڵ ئاودا تێکەڵدەکرێت پێیدەگوترێت (Wet Mount). تێکەڵکردنی ئاو لەگەڵ نموونەکەدا، سوودێکی گرنگی هەیە بۆ ئاسانترکردنی بینینی بەکتیریای کۆلێرا، چونکە دڵۆپەکانی ئاو ئەو بۆشایانە پڕدەکەنەوە کە لە نێوان نموونەکە و سلایدەکە دروستدەبن (Museum of Science,2012)

دۆزینەوەی بەکتیریای کۆلێرا لە نموونەی پیسایی نەخۆش بەس نیە بۆ ئەوەی بە تەواوەتی زانیاری لەسەر جۆری ئەو بەکتیریایە کۆبکرێتەوە. پشکنینێکی تایبەت هەیە بۆ ناساندنی جۆری ئەو بەکتیریای کۆلێرا کە بووەتە هۆی نەخۆشییەکە. (Harrison,2013) ئەم پشکنینە لەڕێی وەستاندنی بەکتیریاکە لە جووڵە دەکرێت بەهۆی دژە تەنێکی تایبەتەوە کە بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنرێت.

بینینی بەکتیریای کۆلێرا لە ژێرا مایکرۆسکۆبدا، ڕاهێنانی تایبەت

و ئەزموونێکی درێژی دەوێت بۆ ئەوەی ئەو پزیشک و کارمەندەی کە مایکرۆسکۆبەکە بەکاردەهێنێت بتوانێت بەکتیریاکە ببینێت. بە مانایەکی تر، بینینی بەکتیریای کۆلێرا لە ژێر مایکرۆسکۆبدا هەروا کارێکی ئاسان نیە و پێویستی بە شارەزایی تەواو هەیە لە بوارەکەدا. بۆیە زانایان پەنایان بردووەتە بەر ئەمراز و میکانیزمی دیکە بۆ دۆزینەوەی بەکتیریاکە لە پیسایی نەخۆشەکاندا.

یەکێک لەو ئامراز و میکانیزمانەی تر کە بۆ جیاکردنەوە و بینینی بەکتیریای کۆلێرا بە بەربڵاوی بەکاردێت شێوازی چاندن (زرع)ە. ئەم میکانیزمە لەڕێی بەکارهێنانی دوو جۆری تایبەتی (چاندن)ەوە دەکرێت کە یەکێکیان پێی دەگوترێت (Taurocholate-tellurite-gelatin TTG) و ئەوی تریان پێیدەگوترێت (Thiosulfate-citrate-bile salts-sucrose TCBS). ئەگەر پزیشکەکان پێشبینی هەر دواکەوتنێکیان کرد لە گواستنەوەی نموونە و سامپڵی پیسایی نەخۆشەکە بۆ تاقیگە ئەوا دەکرێت دوو جۆری تری چاندن بەکاربهێنرێت کە یەکێکیان پێیدەگوترێت Carey –Blair transport medium و ئەوی تریان Alkaline-peptone water enrichment medium.

وەکو ئاشکرایە، ئەم میکانیزمانە لە دۆزینەوەی بەکتیریای کۆلێرا ڕەنگە کات و داهاتی زۆر ببات و پێویستە بە کاتێکی زووتر نەخۆشییەکە بدۆزرێتەوە و چارەسەر بۆ نەخۆشەکان بکرێت. بۆیە زاناکان و توێژەرەکانی بوارەکە لە هەوڵی بەردەوامدان بۆ دۆزینەوەی ئامراز و میکانیزمی خێراتر بۆ دۆزینەوەی بەکتیریاکە. یەکێک لەو شێوازانەی لە حاڵی حازردا لەچەند وڵاتێکی جیهان و لەڕێی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییەوە بەکاردەهێنرێت پێیدەگوترێت Rapid Diagnostic Test ئەم شێوازە تازەیە پێویستی بە چاندن و مایکروسکۆب نیە (بڕوانە بەشی پێنجەم).

## خۆپاراستن:

سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی کۆلێرا دەکرێت لەڕێی کۆمەڵێک ئامراز و میکانیزمی سادە و سەرەتایی وەکو دابینکردنی ئاوی پاکی خواردنەوە و لە ناوبردنی پیسایی و پاشەڕۆکان بە میکانیزم و ئامرازی تەندروستیی و خاوێن کەمبکرێتەوە و ئەکرێت نەخۆشیەکە بنبڕبکرێت. (Harrison,2013) هەروەها بۆ کەمکردنەوەی و بنبڕکردنی نەخۆشییەکە پێویستە شێوازەکانی ئامادەکردن و پاراستنی خواردن لە ماڵەکاندا گرنگی پێبدرێت و بە شێوازێکی تەندروست ئەو کارانە بکرێت.

لە چەند دەیەی ڕابووردوودا، هێز و توانا و داهاتێکی زۆر تەرخانکرا بۆ دۆزینەوەی کوتانێکی کاریگەر دژی کۆلێرا. زۆربەی ئەو هەولآنەی لە بوارەکەدا تاوەکو ئێستا دراون بۆ ئەوە بوون کە ڤاکسینەکە لەڕێگای دەمەوە بدرێت بە کەسەکان. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڤاکسینێک بۆ کۆلێرا کە لە ڕێگای دەمەوە بدرێت بۆ ئەو کێشانە دەگەڕێتەوە کە ڤاکسینە کۆنەکانی نەخۆشیەکە دروستیان دەکرد. بۆ نموونە ئەو ڤاکسینە کۆنانە، لە بەکتیریای مردووی کۆلێرا پێکهاتوون و کاریگەریەکی ئەوتۆیان نیە لە پاراستنی هاولاتیان لە نەخۆشیەکە و هەروەها کۆمەڵێک نیشانەی نەخوازراو لەو کەسانە دروستدەکەن کە وەریدەگرن. چونکە ئەو ڤاکیسنانە لەڕێی سمت و بە دەرزیی دەدرێن، کۆمەڵێک نیشانەی وەکو ئازار و سووربوونەوەی جێگای دەرزیلێدانەکە و بێهێزی و تا، کەڕەنگە لە نەخۆشەکدا سەرهەڵبدەن. هەروەها وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد، ئەم جۆرە ڤاکسینانە کاریگەریەکی ئەوتۆیان نیە لە پاراستنی هاولاتیان لە نەخۆشیەکە. کاریگەری کەمی ڤاکسینەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ناتوانێت بەرگری بۆ نەخۆشەکە لەسەر ئاستی ڕیخۆڵەکان دروستبکات.

وەکو زانراویشە، ڕیخۆڵەکان ئەو دەرگا سەرەکییەن کە بەکتیریای کۆلێرا لەڕێیەوە دەچێتە لەشی مرۆڤەکانە و نەخۆشیەکە دروستدەکات. بۆیە هەر ڤاکسینێک کە بتوانێت بەرگری لەش بۆ بەکتیریای کۆلێرا زیادبکات، دەبێت توانای ئەوەی هەبێت لەسەر ئاستی ڕیخۆڵەکاندا ئەو کاریگەریەی هەبێت.

دوو جۆری ڤاکسینی کۆلێرا لە حاڵی حازردا بوونیان هەیە کە لەڕێی دەمەوە دەدرێنە کەسەکان. جۆری یەکەم لە کۆی خانەیەکی مردووی کۆلێرا پێکهاتووە (Killed whole-cell WC).. لەم دواییانەدا،ئەم جۆرە ڤاکسینە گۆڕانکاری بەسەردا هێنرا و لە حاڵی حازردا ئەمیش دوو جۆری هەیە. ڤاکسینی WC کە تەنها بەکتیریا مردووەکە خۆیەتی و هیچی تری لەگەڵ نیە. جۆرێکی تریش هەیە کە لەگەڵ بەکتیریا مردووەکە، بەشی B لە ژەهری بەکتیریای کۆلێرای بۆ زیادەکرێت و ئەم جۆرەیان پێیدەگوترێت. (WC/BS) دیارە ئەو بەشەی ژەهری بەکتیریای کۆلێرا کە بۆ ئەم جۆرەی دوایی ڤاکسینەکە زیادەکرێت، کاریگەری نیە بۆ سەر نەخۆشەکە و نابێتە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشی. بەڵام ئەم زیادکردنە گرنگی هەیە بۆ زیاتر ئاشناکردنی لەشی مرۆڤ بە بەکتیریای کۆلێرا و دەرئەنجام دروستبوونی بەرگریەکی بەهێزتر و کاریگەرتر و درێژخایەنتر بۆ کەسەکە.

ژمارەیەک توێژینەوەی زانستی لەسەر کاریگەری ئەم ڤاکسینە بۆ پەکخستنی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و پاراستنی هاوڵاتیان لە بەکتیریاکە بە تایبەتی لە وڵاتی بەنگلادش کراون. زۆربەی ئەو توێژینەوانە دەریانخستووە کە ڤاکسینەکان کاریگەریەکی گەورەیان هەیە لەسەر کەمکردنەوەی تووشبوون بە کۆلێرا لەو شوێنانەی کە دەدرێن بە هاوڵاتیان. بۆ نموونە لە شەش مانگی یەکەمی دوای پێدانی ڤاکسینەکە، دەرکەوتووە کە

کاریگـەری ڤاکسـینی جـۆری WC دەگاتـە ٥٨٪ و کاریگـەری ڤاکسـینی جـۆری WC/BS دەگاتـە ٨٥٪. بـەڵام دوای سـێ سـاڵ لـە پێدانیـان، کاریگـەری هـەردوو ڤاکسـینەکە بـۆ ٥٠٪ دابەزیـوە. هەروەهـا توێژینـەوەکان دەریانخسـتووە کـە مانـەوەی بەرگـری لەشـی هاوڵاتیـان بـۆ کۆلێـرا دوای پێدانـی هـەردوو جۆری یەکەمـی ڤاکسینەکە، بۆ ئـەو هاوڵاتیانـە زیاتـر بـووە کـە تەمەنیـان لـە ٥ سـاڵ گەورەتـر بـووە، بـەڵام ئەوانـەی کـە منداڵتربـوون، بەرگـری لەشـیان کەمتـر ماوەتـەوە.

ژمارەیەکـی تـری توێژینـەوە کـە لـە کۆمەڵێـک وڵاتی تری وەکـو ئەفریقیای باشـور و ڤێتنـام و کەلکەتـا (هینـد) دەریانخسـتووە کـە ڤاکسـینەکان کاریگەریـان هەیـە بـۆ کەمکردنـەوەی ڕێژەکانـی تووشـبوون. لـە ئەفریقیـای باشـور، تەنانـەت ڤاکسـینەکە ڕۆڵـی هەبـووە لـە کەمکردنـەوەی ڕێـژەی تووشـبوون بـە کۆلێـرا لەنـاو ئەوانـەی کـە تووشـی ئایـدز بووبـوون. هەروەهـا لـە ڤێتنـام و هینـددا، دەرکەوتـووە، کـە ئـەو ڤاکسـینانەی لـەو بەکتیریایانـە دروسـتدەکرێت کـە لـەو وڵاتانـەدا بڵاوبوونەتـەوە کاریگـەری زیاتـری هەیـە بـە بـەراورد بـەو ڤاکسـینانەی کـە لـە جـۆرە بەکتیریایـەک دروسـتکراون کـە لـە شـوێنی تـردا بڵاوبوونەتـەوە. بەکارهێنانـی ڤاکسـینی کۆلیـرا لەڕێـی دەمـەوە لـە جۆرەکانـی WC و WC/BS تەنهـا ڕۆڵـی نیـە بـۆ پاراسـتنی ئـەو کـەس و نەخۆشـانەی کـە وەریدەگـرن، بەڵکـو سوودیشـی هەیـە بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە وەرینـاگـرن بـەڵام لـە دەوروبـەر و نزیکـی ئەوانـە دەژیـن کـە وەریانگرتـووە. ئەمـە پێـی دەگوترێـت «مێگەلـە بەرگـری» (Herd Immunity)

لـە حاڵـی حـازردا، ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهانییـی بـە توندی ئامـۆژگاری ئـەو وڵات و ناوچانـە دەکات کـە کۆلێرایـان تێیـدا نیشـتەجێیە، کـە ڤاکسـینی کۆلێـرا و کوتانـی دژی ئـەو نەخۆشـیە بـە گرنگیـەوە وەرگـرن و وەکـو بەشـێک لـە کاردانەوەیـان بەرامبـەر بـە نەخۆشـییەکە بەکاربهێنـن.

**هەردوو جۆری ڤاکسینی WC و WC/BS لە ئەورووپا دەستدەکەوێت و دەکرێت وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان و لایەنە پەیوەندیدارەکان هەناردەی کوردستانی بکەن.**

جۆری دووەمی ئەو ڤاکسینانەی کۆلێرا کە لەرێی دەمەوە دەدرێت، لە حاڵی حازردا لەژێر توێژینەوە و لێکۆڵینەوەن و هێشتا بواریان پێنەدراوە کە بەکاربهێنرێن. ئەم جۆرانە سوود لە بەکتیریای ساغی کۆلێرا دەبینن و بەکارهێنانی ڤاکسینەکە مەرجدار ناکەن بە کوشتنی بەکتیریاکە وەکو لە جۆری یەکەمدا بینیمان. زاناکان لە هەوڵی ئەوەدان کە بتوانن کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە جینات و کرۆمۆسۆماتی بەکتیریای کۆلێرا بکەن بە جۆرێک کە توانای بەکتیریاکە بۆ دروستکردن و ڕژاندنی ئەو ژەهرەی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نیشانەکانی کۆلێرا، لەناوببەن. ئەگەر لەوەدا سەرکەوتووبن، زاناکان دەتوانن بەکتیریایەکی کۆلێرا دروستبکەن کە لە هەموو خەسڵەتەکانیدا لە بەکتیریای کۆلێرا دەچێت و لەشی مرۆڤیش بەو شێوازە مامەڵەی لەگەڵ دەکات کە بەکتیریای کۆلێرایە و سوودی ئەوەی هەیە کە لەشی مرۆڤ بەرگری دژی دروستدەکات لە کاتێکدا کە بەکتیریاکە نیشانەکانی نەخۆشیەکە دروستناکات.

یەکێک لەو جۆرە ڤاکسینەی سەرەوە لە حاڵی حازردا توێژینەوەی لەسەر دەکرێت و پێیدەگوترێت CVD 103-HgR توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە ئەم جۆرە ڤاکسینە سەلامەتە و نابێتە هۆی سەرهەڵدانی زەرەر و کێشە بۆ ئەو کەسانەی کە بەکاریدەهێنن. بەڵام لە توێژینەوەیەکی فراواندا کە بۆ ئەم ڤاکسینە لە ئیندونیسیا کراوە، دەرکەوتووە کە ڤاکسینەکە کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبووە بۆ دروستبوونی بەرگری بۆ ئەو کەسانەی کە بەکاریدەهێنن. هەندێک ڤاکسینی تری هاوشێوەی ئەوەی سەرەوە لە حاڵی حازردا لەژێر لێکۆڵینەوەدان و لە جۆرەکانی بەکتیریای

کۆلێرای وەکو El Tor و O139 دروستدەکرێن.

دەزگا زانستی و ئەکادیمیی و ڕێکخراوە تایبەتمەندەکانی بوارەکە، گرنگیەکی گەورە دەدەن بە دروستکردنی ڤاکسینێکی کاریگەر بۆ کۆلێرا. ئەو دەزگا و ڕێکخراوانە بە تایبەتی جەخت لەسەر دابینکردنی ئەو ڤاکسینانە بۆ خەڵکانێک دەکەن کە بەرگری لەشیان کەمبووەتەوە بە هۆی کۆمەڵێک فاکتەری وەکو بەدخۆراکی و کەمخۆراکی و تووشبوون بە نەخۆشی ئەیدز... هتد.

## چارەسەر:

کۆلێرا نەخۆشیەکی کوشندەیە ئەگەر هاتوو زوو نەخۆشەکە چارەسەر نەکرا. هۆکاری سەرەکی مردن بە هۆی کۆلێرا، بریتیە لە تووشبوون بە شۆک (Harrison,2012). بۆیە هەنگاوی یەکەم لە چارەسەرکردنی کۆلێرا، وەرگرتنی ئەو ئاو و شلەمەنییەیە کە نەخۆشەکە لەڕێی سکچوون و ڕشانەوەوە لەدەستی دەدات (بە تایبەتی سکچوون ).

دەکرێت لەو نەخۆشانەی کە وشکبوونەوەی لەشیان نەگەیشتووەتە ئاستێکی زۆر، لەڕێی دەمەوە شلەمەنی و ئاو بدرێت بە نەخۆشەکە. لە پاڵ ئاو و شلەمەنی ڕۆژانە و ئاسایی، دەکرێت نەخۆشەکە ئەو شلەمەنی و خوێیەی کە لەدەستیداوە لەڕێی بەکارهێنانی ئەوەی پێیدەگوترێت (Oral Rehydration Solution ORS) وەرگرێت. چەند جۆرێکی جیاجیا و هەمەڕەنگ هەیە بۆ ORS کە دەشێت بەکاربهێنرێت بۆ نەخۆشییەکە. ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئامۆژگاری ئەوە دەکات کە ئەو ORSی بەکاردەهێنرێت پێویستە ڕادەی خەستییەکەی لە خوارەوە بێت. هەروەها ئەگەر دەستبکەوێت، باشتر وایە جۆرێک لە ORS بەکاربهێنرێت کەوا لە برنج پێکهاتبێت.

ئەگەر ORS پەیدا نەبوو دەکرێت کەسوکاری نەخۆشەکە خۆیان لە ماڵەوە ئەو شلەمەنییە ئامادەبکەن لەڕێی تێکەڵکردنی بڕی نیو کەوچکی چا لە خوێ و چوار کەوچکی نانخواردن لە شەکر لەگەڵ یەک لیتر ئاوی خواردنەوە. چونکە ئەم گرتەیە، پۆتاسیۆمی تیا نیە کە زۆر گرنگە بۆ لەشی مرۆڤ و لەڕێی سکچوونی زۆرەوە لە دەستدەچێت، بۆیە پێویستە نەخۆشکە لەڕێی خواردنی مۆز و ئەو میوانەی تر کە دەوڵەمەندن بە پۆتاسیۆم لە دەستدانی ئەو ماددەییە کەمبکاتەوە.

ئەگەر هاتوو نەخۆشەکە زۆر ماندوبوو و بەهۆی ڕشانەوە و سکچوونەوە توانا و هێزی ئاوخواردنەوەی نەمابوو، ئەوا باشتر وایە لەڕێی سۆندەوە ORSی بدرێتێ. بەڵام لەو نەخۆشانەی کە بارودۆخی تەندروستییان زۆر خراپە و ناشێت چاوەڕوانی وەرگرتنی شلەمەنی بە دەم بکەن، پێویستە لەڕێی دەمارەوە شلەمەنی و ئاو بکرێتە لەشیانەوە. لە نێو ئەو (مغذی)یانەی کە هەن، باشترینیان Ringer's Lactateە. ئەو مغذیە باشترینی ئەو ئاوانەیە کە دەستدەکەوێت، چونکە ترشی لەشی نەخۆشێک کە کۆلێرای هەبێت دادەبزێتە خوارەوە و پێویستە و ناکرێت جۆرە مغذیەکی پێبدرێت کە ئەو ترشیەی لەش زیاتر بەرەوسەرەوە بەرێت. دەبێت پۆتاسیۆم لەگەڵ ئەو مغذیەدا بدرێت و باشتر وایە ئەوەی دوایی لەڕێی دەمەوە بدرێت بە نەخۆشەکە.

دەکرێت کۆی ئەو ئاوەی کە نەخۆشەکە لە دەستی داوە، لە ماوەی ٤-٦ کاژێردا بگوازرێتەوە بۆ لەشی. نیوەی کۆی ئاوەکە دەکرێت لە نیو کاژێری یەکەمدا بدرێت بە نەخۆشەکە. لە کاتی پێدانی ئاوەکە و گواستنەوەی شلەمەنی بۆ لەشی نەخۆشەکە، حاڵەتێکی باو ڕوودەدات لە زۆربەی نەخۆشەکاندا کە ئەوەیش ڕەقبوون و ئازاری ماسولکەکانە. دوای ئەوەی کە بڕی پێویستی ئاو و مغذی لەڕێی دەمارەوە دەدرێت بە

نەخۆشەکە دەکرێت خۆی بەردەوام بێت لە خواردنەوەی ئاو و شلەمەنی. ئامانجی سەرەکی لەم پرۆسەیە ئەوەیە کە ئەو برە ئاوەی کە نەخۆشەکە لەرێی رشانەوە و سکچوونەوە لەدەستیدەدات، هەمان بڕ لەرێی دەمار و دەمەوە وەریگرێتەوە. بەڵام ئەو نەخۆشانەی کە برێکی زۆری شلەمەنی لەرێی سکچوونەوە لە دەستدەدەن، رەنگە پێویستیان بەوە هەبێت کە بۆ ماوەیەکی درێژ لەرێی دەمارەوە ئاو و شلەمەنی بکرێتە لەشیانەوە. یەکێک لە مەترسیدارترین ئەو کاریگەرە خراپانەی کە سکچوونی توندی کۆلێرا دروستیدەکات، بریتیە لە لەدەستدانی برێکی زۆری پۆتاسیۆمی لەش. هەرچەندە دەکرێت ئەو پۆتاسیۆمە لەرێی دەمارەوە بدرێتەوە بە نەخۆشەکە، بەڵام رەنگە پێدانی پۆتاسیۆم لەرێگای دەمارەوە مەترسی دروستبکات بۆ سەر گیانی نەخۆشەکە. بۆیە لەشوێنێکدا کە ئەگەر کارمەندی تەندروستیی راهێنراوی لێ نەبوو، باشتر وایە پۆتاسیۆم لەرێی دەمەوە بدرێت بە نەخۆشەکە.

بەکارهێنانی ئەنتیبایۆتیک پێویست نیە بۆ بنبڕکردنی کۆلێرا لە نەخۆشێک کە تووشی بەکتیریاکە هاتبێت. بەڵام ئەنیتبایۆتیک دەتوانێت ماوەی بەردەوامبوونی سکچوون لە نەخۆشکە کەمبکاتەوە. هەروەها دەتوانێت بڕی ئەو شلەمەنییەی کە لە لەشی نەخۆشەکە دەروات کەمبکاتەوە و فرێدانی بەکتیریاکە لە لەشی نەخۆشەکە خێراتر بکات. رێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئامۆژگاری پزیشکان دەکات کە ئەنتیبایوتیک تەنها لە کاتێکدا بدەن بە نەخۆشەکە ئەگەر هاتوو ئەوەی دوایی تارادەیەکی زۆر تووشی وشکبوونەوە هاتبێت لە ئەنجامی سکچوونەوە. دەکرێت دۆکسیسایکلین (٣٠٠ ملغ یەک جار) یا تیتراسایکلین (١٢.٥ ملغ/ کلغم رۆژی چوار جار بۆ سێ رۆژ) بدرێت بەو نەخۆشانەی کە رادەی وشکبوونەوەیان زۆرە. ئەم دەرمانانە دەکرێت بۆ کەسانی گەورە بەکاربهێنرێت بەڵام ناشێت بۆ منداڵ بەکاربهێنرێن. ئەگەر هاتوو لە

منداڵدا بەکارهێنرا، ئەوا دەبنە هۆی تێکچوونی ڕەنگی ددانی منداڵەکە و هەروەها دروستبوونی کێشە و تەنگوچەڵەمە لە گەورەبوون و دروستبوونی ئێسکی منداڵەکە. هەروەها ئەم جۆرە دەرمانانە دەبێت بە ورياييەکی زۆرەوە بدرێت بە نەخۆشەکە، چونکە ڕەنگە ببێتە هۆی دروستبوونی بەرگری لە لای نەخۆشەکە و دواتر ئەو دەرمانانە کاریگەریان نەمێنیت لەسەر بەکتیریای کۆلێرا.

لەو شوێن و ناوچانەی کە بەکتیریای کۆلێرا بەرگری هەیە بۆ تیتراسیکلین، باشتر وایە چەند دەرمانێکی وەکو سیپرۆفلۆکساسین بدرێت (یا یەک جار بە بڕی ٣٠ملغ/کغم یاخود ١٥مغ/کغم رۆژی دوو جار بۆ ٣ رۆژ) یا ئیریثرۆمایسین (٤٠-٥٠ مغ/کغم رۆژانە دابەشبکرێت بەسەر سێ ژەمدا و بۆ ماوەی ٣ رۆژ) یا ئەزیثرۆمایسین (یەک جار ١ گرام).

ئەگەر هاتوو کۆلێرا لە منداڵ یا لە ژنی دوو گیان سەریهەڵدا، ئەوا لەڕێی ئیرویثرۆمایسین یاخود ئەزیثرۆمایسینەوە چارەسەر دەکرێت.

# کورتەی بەشی دووەم

•وشەی کۆلێرا چەند مانایەکی جیاوازی هەیە کە بەپێی سەرچاوەکان دەگۆڕێت؛ وشەکە بە مانای لێڕویشتنی ئاوی زراو و زێراب و ڕیخۆڵە دێت.



•نەخۆشی کۆلێرا لە نووسینە چینی و هیندی وفارسی و عەرەبییە کۆنەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە، بەڵام هیچێک لەوانە باسی بڵاوبوونەوەیەکی فراوانی نەخۆشییەکە ناکەن.

•لەم کتێبەدا، وشەی (پانەتا) بۆ پەتایەک بەکاردەهێنین کە سنووری چەند وڵاتێک دەبەزێنێت.

•قۆناغە مێژووییەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا دەکرێت بۆ ئەمانەی خوارەوە پۆلێن بکرێت:

- پێش ١٨١٧
- ١٨١٧-١٨٢٣
- ١٨٢٩-١٨٥١
- ١٨٥٢-١٨٥٩
- ١٨٦٣-١٨٧٩
- ١٨٨١-١٨٩٦
- ١٨٩٩-١٩٢٣
- ١٩٦١-ئێستا

- شوێنی جیوگرافی عێراق زەمینەی بۆ بڵاوبوونەوەی کۆلێرا خۆشکردووە.

•لە ساڵی ١٨٢٠دا بۆ یەکەمین جار کۆلێرا هاتە عێراقەوە

•لە ساڵی ١٨٨٩دا کۆلێرا لە عێراقدا بڵاوبووەوە و ئێران سنوورەکانی خۆی لەگەڵ عێراق بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە داخست.

•لە ساڵی ١٩٢٧دا جارێکی تر کۆلێرا لە عێراق بڵاوبووەوە و ئێران فەرمانی دەرکرد کە کەس سەفەری عێراق نەکات.

•لە ساڵی ١٩٦٦دا، ٢٢٧ کەس تووشی نەخۆشیەکە بوون و لەوانە ٢٠ یان مردن.

•لە ماوەی ٤٠ ساڵی رابووردوودا، هەر پەتایەکی کۆلێرا ڕوویدابێت، بۆ ماوەی ٣ مانگ بەردەوام بووە و لە ساڵی دوای ڕوودانی پەتاکە شەپۆلێکی دووەم ڕوویداوە.

•لە ساڵی ١٩٩٠ و دواتر جەنگی کەنداوی ساڵی ١٩٩١دا، کۆلێرا دیسانەوە بە خەستی لە عێراقدا سەریهەڵدایەوە.

•لە ساڵی ١٩٩٨دا، زیاد لە ٢٥٦٠ کەس تووشی کۆلێرا بوون لە عیراقدا.

•لە ساڵی ٢٠٠٣دا، کۆی ١٨٧ کەس تووشی کۆلیرا بوون.

•لە ساڵی ٢٠٠٧، ژمارەی ئەوانەی کە تووشبوون بە نەخۆشییەکە گەیشتە ٤٤٦٧ کەس و ژمارەی مردووەکانیش ٢٤کەسی تێپەڕاند.

•لە ساڵی ٢٠٠٨دا، ٩٢٥ کەس تووشی کۆلێرا بوون و ١١ کەس بە نەخۆشیەکە مردن لە عیراقدا

•لە ساڵی ٢٠٠٩، تەنها ٦ کەس تووشی کۆلێرا بوون.

## مێژووی کۆلێرا

پێش ئەوەی باسی مێژووی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بکەین، گرنگە تیشک بخەینە سەر سەرچاوەی زمانەوانی ئەو دەستەواژەیەی بۆ نەخۆشیەکە بەکاردەهێنرێت و ریشە مێژوویەکانی دەستەواژەکە دیاری بکەین. بۆ یەکەم جار وشەکە لە کارەکانی مێژوونووس و پزیشکی ناسراوی یۆنانی هیپۆکریتس بینراوە (Lacey,1995) ناکۆکیەکی زۆر هەیە لەسەر سەرچاوەکانی وشەی کۆلێرا و ریشە مێژوویەکانی ئەو دەستەواژەیە. بەڵام بە گشتی سێ ڕا هەیە لەسەر ئەوەی کە وشەکە لەچیەوە هاتووە. ڕای یەکەم پێی وایە کە وشەی کۆلێرا لە دوو وشەی یۆنانی کۆن پێکهاتووە کە (chole) یە بە مانای (زەرداو) و وشەی (rein) بە مانای (لەبەررۆیشتن). ئەوەی سەرەنجراکێشە لێرەدا، ئەوەیە کە لێکچوونێکی گەورە هەیە لە نێوان وشەی دووەم و وشەی (rain)ی ئینگلیزی کە واتای باران دەگەیەنێت. لە خوارەوە باسی دەکەین بۆچی ئەم لێکچوونە گرنگە.

ڕای دووەم دەربارەی سەرچاوەکانی وشەی کۆلێرا پێی وایە کە دەستەواژەکە لە وشەی (cholera)ی دیسان یۆنانی کۆنەوە هاتووە کە مانای زێراب دەگەیەنێت

(Barua & Greenough 1992). ڕەنگە یۆنانیە کۆنەکان ئەو سکچوون و ڕشانەوەی تووشی نەخۆشەکانی کۆلێرا دەبوو بە ئاوی باران شوبهاندبێت کە بە زێرابی سەربان‌دا دێتە خوارەوە (Lacey 1995) بۆ ئەوەی کۆلێرا کە بە مانای گشتیەکەی زێراب دەگەیەنێت، لەوەی دوایی جیابکرێتەوە و زیاتر ئاماژە بە نەخۆشیەکە بکات، وشەی (nousos)ی بۆ زیادکرا. ئەو وشەیەی دوایی لە یۆنانی کۆندا بە مانای نەخۆشی دێت.

هەرچی ڕای سێیەمە پێیوایە وشەکە لە دەستەواژەی (cholades) ی یۆنانیەوە. هاتووە کە مانای ڕیخۆڵە دێت (Barua & Greenough 1992). ئەم ڕایە بۆ یەکەم جار لە لایەن زانایەکەوە بەناوی (ئەلکساندەر ترالیانۆس) لە ساڵی ١٦٢٢دا ئاشکرا کرا. ئەو زانایە پێی وابوو وشەکە لە هەموو ئەوانی تر نزیکترە لە نەخۆشیەکەوە، چونکە سکچوونی کۆلێرا بەشێویەکی سەرەکی لە ئەنجامی دەرکردنی شلەمەنی لە ڕیخۆڵەکانەوە دروستدەبێت نەک لە زراوەوە وەکو ئەوەی ڕای یەکەم باسی دەکرد.

لە پاڵ یۆنانیە کۆنەکاندا، هیندیەکانیش لە پێش زایندا باسی کۆلێرایان کردووە. یەکێک لە باشترین گێڕانەوەکان دەربارەی کۆلێرا لە مێژووی کۆندا بە زمانی سانسکریتی لە ساڵەکانی ٥٠٠–٤٠٠ی پێش زاین نووسراوە. ئەو دۆکۆمێنتەی باسی نەخۆشیەکە دەکات پێی دەگوترێت سوشروتا سامهیتا (Bhishagratna,1907) لەو دۆکۆمێنتەدا، نەخۆشیەک باس دەکرێت کە خەسڵەتەکانی زۆر نزیکە لە کۆلێرا. لەوێدا دەستەواژەی (visuchika) بەکاردەهێنرێت (Barua & Greenough,1992). ئەو وشەیە لە سانسکریتیدا بە مانای تێکچوونی جووڵەی ڕیخۆڵەکان یا گەدە، دێت.

لە سەردەمی عەباسییەکاندا، چەند زانایەک باسی کۆلێرایان کردووە. لەو زەمەنەدا الرازی وشەی (حایدا) ی بۆ گوزارشتکردن لە کۆلێرا بەکارهێنا. وشەکە بە عەرەبی مانای داڕوخان یا شکان دەگەیەنێت و کت و مت گوزارشت لە دۆخی ئەو کەسە دەکات کە تووشی کۆلێرا بووە. ئەم وشەیە لە لایەن دوو زانای سەردەمی خەلافەتی عەباسییەکان بە ناوەکانی (الرازی) و (ابن سینا) بەکارهێنراوە. لە خوارەوە باسی ئەو دوو زانایە بە درێژی دەکەین. هەندێک زانای عەرەبی تر دوای الرازی و ابن سینا وشەی (الوباء)یان بۆ کۆلێرا بەکارهێنا. هەرچەندە ئەم وشەیەی دوایی وشەیەکی گشتییە و ئاماژە بۆ هەموو درمێکی خەتەرناک یا فراوان دەکات، بەڵام بەکارهێنانی وشەکە بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر خەتەرناکی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لەو زەمەنەدا.

نزیکەی ٢٠٠٠ساڵ پێش ئێستاو لە چینی کۆندا باسی کۆلێرا کراوە. ئەو وشەیەی بۆ کۆلێرا لەو زەمەنەدا بەکارهێنراوە وشەی (fok lun) (Barua & Greenough,1992) دەستەواژەکە مانای هەبوونی شتێک دەگەیەنێت کە لەناو گەدە و ڕیخۆڵەکاندا کۆبووەتەوە و لەرێی ڕشانەوە و سکچوونەوە دەردەکرێت.

لە حاڵی حازردا چینییەکان وشەی (huo luon) بۆ کۆلێرا بەکاردەهێنن کە لە نووسراوە چینییە کۆنەکانیشدا بەرچاو دەکەوێت. ئەم وشەیەی دوایی ژمارەیەکی زۆری نەخۆشی دەگرێتەوە کە هەموویان تووشی گەدە و ڕیخۆڵەکان دەبن و هۆکاری ڕشانەوە و سکچوونن.

بە شێویەکی گشتی نووسینە یۆنانی و هیندیە کۆنەکان و چینیەکان نزیکەی ٢٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا باسی کۆلێرایان کردووە. بەڵام ئەوەی جێگای سەرسوڕمانبێت ئەوەیە کە هیچێک لەو نووسینانە ئاماژە بە بڵاوبوونەوەیەکی فراوانی درمەکە ناکەن و باسی مردنی ژمارەیەکی

زۆری خەڵـک ناکـەن بـە نەخۆشـیەکە (Lacey,1995). ڕەنگـە هـۆکاری بڵاونەبوونـەوەی درمێکـی فراوانـی کۆلێـرا لـەو زەمەنـدا بـۆ ئـەوە بگەڕێتـەوە کـە دانیشـتوانی زەوی وەکـو دواتـر زۆر نەبـوون و هەروەهـا هاتووچـۆ و جوڵـەی خەڵـک و ئـاژەڵ بـەو شـێوازە نەبوو کـە لـە دواتـردا پەرەدەسـێنێت.

لـە پـاڵ ئـەو دەسـتەواژانەی لەسـەرەوە باسـمان کـرد، کۆمەڵێـک دەسـتەواژەی تـر هـەن کـە بـە تایبەتـی لـە فارسـی و لـە ئێرانـدا باویـان هەبـوو. لـە فارسـیدا دوو دەسـتەواژەی بـاو بـۆ کۆلێـرا بـە کاردەهێنـرا کـە بریتـی بـوون لـە (وبائـی پایـزە) واتـە نەخۆشـی پایـز و هەروەهـا بـۆ ئـەو کۆلێرایـەی لـە منداڵـدا ڕوویـدەدا دەسـتەواژەی (سـەقل سـارد) بەکاردەهێنـرا (Azizi MH,2009). هەروەهـا بـە هـۆی ئـەوەی کـە ژمارەیەکـی زۆر لـە نەخۆشـەکان دەمـردن، کۆلێـرا لـە ئێرانـدا پێـی دەوگوتـرا (مەرگـی مەرگیـی) یـا (مـرض المـوت).

هەبوونـی ژمارەیەکـی زۆری وشـە و دەسـتەواژە لـە زمانـە کۆنەکانـی وەکـو یۆنانـی و سانسـکریتی، هەروەهـا لـە عەرەبـی و فارسـی و چینیشـدا، ئـەوە دەردەخـەن کـە کۆلێـرا لـە کۆنـەوە هەبـووە. بـەڵام هەبوونـی ئـەو ژمـارە زۆرە لـە دەسـتەواژە و وشـە ڕەنگـە بـۆ نەخۆشـی و کێشـەی تەندروسـتیی تـری تایبـەت بـە گـەدە و ڕیخۆڵـەکان بەکارهاتبێـت. واتـە مـەرج نیـە هەمـوو ئـەو دەسـتەواژانەی کـە قسـەمان لەسـەر کـردن، باسـی کۆلێـرا بکـەن و دەشـێت بـۆ نەخۆشـی و کێشـەی تەندروسـتیی دیکـەش بەکارهاتبـن. بۆیـە خوێندنـەوە و بەدواداچوونـی مێژوویـی بـۆ سـەرچاوەکانی کۆلێـرا و بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـیەکە لـە ڕابـووردوودا هـەروا کارێکـی ئاسـان نەبێـت (Barua,1992 & Greenough).

لـە خـوارەوە ئـەو قۆناغـە مێژووییانـە بـاس دەکەیـن کـە کۆلێـرای تێیـدا بڵاوبوەتـەوە.

## پێش ١٨١٧:

هەندێک لە مێژوونووسەکان و پزیشکان پێیان وایە کە کۆلێرا لە پێش ساڵی ١٨١٧دا بوونی نەبووە (Lacey,1995). ئەو نووسەرانەی پێیان وایە ئەو نەخۆشیەی کە نووسراوە یۆنانی و هیندیە کۆنەکان باسی دەکەن جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ نەخۆشی کۆلێرا وەکو ئەوەی لە سەدەی نۆزدە و بیستدا دەناسرێت. لە نووسراو و دۆکۆمێنتە یۆنانی و هیندیەکاندا، بە زۆری باسی ڕشانەوە دەکرێت کە ژمارەیەکی زۆری ئەو نەخۆشانە تووشی دەبن ئەگەری کۆلێرایان لێ دەکرێت لەو کاتەدا. بەڵام ڕشانەوە بەشێکی سەرەکی نەخۆشی کۆلێرا نەبووە بە تایبەتی ئەوەی کە لە سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی ٢٠دا بڵاوبووەوە. لە حاڵی حازردا ژمارەیەکی زۆری ئەوانەی تووشی کۆلێرا دەبن بە هەمان شێوەی ئەوەی کە لە نووسراو و دۆکۆمێنتە هیندی و یۆنانیە کۆنەکاندا باس دەکرێت ڕشانەوەیان هەیە.

بۆی ئەوەی خوێنەر بۆ خۆی بڕیار لەسەر ئەوە بدات کە ئایا ئەوەی لە کۆندا باسکراوە کۆلێرایە یاخود نەخۆشیەکی ترە، ڕەنگە سوودی هەبێت لێرەدا گێڕانەوەیەکی هیپۆکریتس بۆ نەخۆشی کۆلێرا بکەین بە کوردی (Macpherson ,1884).

"لە ئەثینا پیاوێک گرفتاری کۆلێرا بوو. پیاوەکە ڕشایەوە و سکیچوو و ئازاری هەبوو. نە ڕشانەوکە و نە سکچوونەکەش ڕاوەستانیان بۆ هەبوو. دەنگی لەبەر بڕا و جوڵەی نەما و چاوەکانی ڕەش هەڵگەڕان و چوونە قوڵییەوە. گرژبوونەوەی گەدە پیاوەکەی لە جێگای خۆی بێ جووڵە هێشتبووەوە و زوو زوو نزگەرەی دەدا. سکچوونەکە لە ڕشانەوەکە زۆرتر بوو. پیاوەکە ئەوەندی بۆی کرا شۆربای نیسکی

خواردەوە. بەڵام دوای ئەوە هەمووی هەڵهێنایەوە. دیسان شۆرباکەیان بە زۆر پێ خواردەوە. ڕشانەوە و سکچوونەکە وەستا بەڵام هەستی بە سەرما دەکرد."

کۆلێرا بە تەنها لە لایەن یۆنانی و هیندیە کۆنەکانەوە باس نەکراوە، بەڵکو لە لایەن چەند زانایەکی سەردەمی خەلافەی عەباسییەکان باسکراوە وەکو ابو بکر محمد بن یحیی بن زکریا الرازی و ابو علی الحسین ابن عبداللـه ابن سینا (Barua & Greenough,1992). ئەم دوو زانایە کە لە دەوروبەری ساڵی ٩٠٠ زاینی لە بەغدای پایتەختی خەلافەتی عەباسیدا ژیاون بە درێژی باسی کۆلێرایان کردووە. زۆرێک لە شارەزاکانی بوارەکە پێیان وایە کە ابن سینا یەکەم زانایە کە ‹ئاوی برنج›ی بۆ ناساندنی سکچوونی کۆلێرا بەکارهێنابێت.

پێش سەدەی ١٧، کۆلێرا زۆر بە کەمی باسدەکرێت. ڕەنگە ئەو کەم باسکردنە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە کۆلێرا پەتایەک نەبوو کە ناوە ناوە سەرهەڵبدات، بەڵام لە ڕاستیدا ڕەنگە نەخۆشیەک بووبێت کە بە بەردەوامی و بە ژمارەیەکی کەم خەڵکی تووش کردبێت. ئەمە لە گێڕانەوەکانی دەریاوانە پورتوگالیەکاندا زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت کە لە دەوروبەری ساڵەکانی ١٥٠١دا سەردانی هیندیان کردووە و باس لە هەبوونی درمێکی درێژخایەنی وەکو کۆلێرا لەو ناوچەیە دەکەن (Barua& Greenough ,1992).

لە کتێبی «گەشەسەندنی زانستی پزیشکی لە سەردەمی نوێدا» نووسەری کتێبەکە (نود فابەر) باسی کارەکانی پزیشکێکی بەریتانی دەکات بە ناوی د. تۆماس سیدنهام. ئەوەی دوایی بڵاوبوونەوەی پەتایەک دەگێڕێتەوە لە لەندەن لە ساڵی ١٦٦٧ کە بووەتە هۆی مردنی ٢٠٠٠ کەس لە ٥٠٠٠٠٠ کەس کە ئەو کات کۆی دانیشتوانی

شـارەکەی پێکدەهێنـا (Barua& Greenough ,1992).

د. سـیدنهام پێـی وابـوو کـە ئـەو پەتاییـەی لـە لەنـدەن بڵاوبـووەوە کۆلێرا بـوو. بـەڵام پزیشـکێکی تـر کـە لـە هەمـان کاتـدا لـە شـارەکە کاری دەکـرد و نـاوی (د. ولـس) بـوو، گوتـی ئـەو پەتایـە کۆلێرا نیـە و بەڵکـو دایزەنتەریەکـی قورسـە کـە بـە بەربـڵاوی تووشـی دانیشـتوانی شـارەکە بـووە (Macpherson ,1884). ئەگـەر ئـەو پەتایـەی کـە لـە لەنـدەن لـە سـاڵی ١٦٦٧ بڵاوبـووەوە کۆلێـرا بووبێـت یـا نـا، لـەو ڕاسـتیە ناگۆڕێـت کـە گێڕانەوەکـی د. سـیدنهام و د. ولـس دوو گێڕانـەوەی وردن لەسـەر نەخۆشـیەک کـە زۆر لـە کۆلێـرا لـە حاڵـی حـازردا دەچێـت.

زانایەکـی تـر بـە نـاوی (ڤـان سـویتن) باسـێکی کورتـی کۆلێـرا دەکات کـە لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٧٤٢ بـۆ ١٧٤٧ بڵاوبووەتـەوە. هەروەکـو هیپوکریتـس، ئەویش بـە هەمـان شـێوە وەکـو سـکچوون و ڕشـانەوەیەکی بەهێـز و تونـد باسـی کۆلێـرا دەکات. هەروەهـا لـە ١٧٦٩دا. گەشـتیارە فەرەنسیەکان بڵاوبوونـەوەی پەتایەکـی کۆلێـرا دەگێڕنـەوە کـە بووەتـە هۆی مردنـی ٦٠٠٠٠ کـەس لـە نزیـک شـاری پۆندیچیـری هینـد. بـەڵام یەکەمیـن پەتایـەک لـە هینـد کـە بـە وردی باسـکرابێت و لەسـەری نووسـرابێت لـە سـاڵی١٧٨١دا بڵاودەبێتـەوە لـە نزیـک شـاری گانجـام لـە خـوارووی هینـد (Lacey ,1995). لـە سـاڵی ١٧٨٣یشـدا کۆلێـرا بـە تـەواوی شـاری کەلکەتـادا بڵاوبـووەوە و شـارەکانی سـیلحەت و هەرداواریشـی گرتـەوە. لـە هەمـان سـاڵدا، دەریاوانـە بەریتانیـاکان کـە لـە کەلکەتـا مابوونـەوە توشـی نەخۆشـیەکە بـوون و لەگـەڵ خۆیانـدا بـۆ سـریلانکایان گواسـتەوە.

بـە شـێویەکی گشـتی کۆلێرا لـە هەشـتاکانی سـەدەی ١٨دا بـە هیندا بـە فراوانـی بڵاوبـووەوە. بـەڵام کۆلێـرا وەکـو ئـەو نەخۆشـیەی کە ئێسـتا پێناسـە دەکرێـت و دەناسـرێت، وەکـو پەتایـەک کـە لـە یـەک کاتتـدا لـە زیـاد لـە

کیشوەرێک یا هەموو جیهان بگرێتەوە، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٨١٧دا دیسان لە هیند بڵاوبووەوە. تاوەکو ئێستا حەوت جار کۆلێرا بە هەموو جیهان یا زیاد لە کیشوەرێک لە جیهاندا لە یەک کاتدا بڵاوبووەتەوە. پێ دەچێت حاڵی حازر جیهان لە جاری هەشتەمی بلاوبوونەوەی فراوانی کۆلێرا بە هەموو جیهاندا تێپەڕێت. لە خوارەوە بە کورتی باسی هەر یەکێک لەو جارانە دەکەین کە کۆلێرا بە هەموو جیهاندا بڵاوبووەتەوە. لە زمانی ئینگلیزیدا، هەر نەخۆشیەکی گوازراوە کە لە یەک کاتدا بە زیاد لە کیشوەرێک یا بە هەموو جیهاندا بڵاوببێتەوە پێی دەوترێت (Pandemic). وشەکە سەرچاوەکەی لە یۆنانیەوە وەرگیراوە و لە دوو بەش پێکدێت (Pan) کە مانای گشت یا هەمووە و (Demic) واتە خەڵک (Wikipedia ,2013) لە کوردیدا هیچ وشەیەکی تایبەت نیە بەرامبەر بە (Pandemic) بۆیە لێرەدا وشەی (پانەتا) بەکاردەهێنین. وشەکە لە دوو بەشی (پان) واتە گشت، یا کۆ و (تا) کە بەشی دووەمی وشەی (پەتا)ی کوردییە.

## پانەتای یەکەم (١٨١٧-١٨٢٣):

پانەتای یەکەم لە ساڵی ١٨١٧دا دەستی پێکرد و لە ساڵی ١٨٢٣دا کۆتایی پێ هات. دوو جەنگ کە لەو کاتەدا ڕوویاندا، ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە بڵاوبوونەوەی ئەم پانەتایە. جەنگی عومان و جەنگی نێوان تورکیا و ئێرانی ئەوکات هۆکارێکی سەرەکی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بوون. پانەتاکە بە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا و یاباندا بڵاوبووەوە. ئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی لە هاتوچۆی دەریاوانی کە لەو کاتەدا پەرەیسەند، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە یارمەتیدانی بڵاوبوونەوەی پانەتاکە (Lacey ,1995).

## پانەتای دووەم (١٨٢٩-١٨٥١):

ئەم پانەتایە بە زۆری ڕووسیای گرتەوە. کۆلێرا بە شێوەیەکی فراوان بە تایبەتی لە شاری مۆسکۆ بڵاوبووەوە. ڕەنگە ئەو بەکتیریایانەی کە پانەتای یەکەمیان دروستکردبێت هەر ئەوانە بوون کە بوونە هۆی پانەتای دووەم لە ڕووسیا بەهۆی نزیکی شوێنی بڵاوبوونەوەی دووەم و یەکەم پانەتا. بەڵام چونکە پانەتا زیاد لە کیشوەرێک و ناوچەیەک لە جیهاندا دەگرێتەوە لە یەک کاتدا، کۆلێرا بە تەنها لە ڕوسیا یا لە شاری مۆسکۆ نەمایەوە و بە چەند ناوچەیەکی تری دنیادا بڵاوبووەوە. بۆ نموونە لە هەردوو ساڵی ١٨٢٨ و ١٨٣١دا کۆلێرا لە عەرەبستاندا بڵاوبووەوە. پەتاکە زۆر بە خراپی شاری مەککەی گرتەوە و یەکێک لە مێژوونووسەکانی ئەو کات دەنووسێت کە بە هۆی زیادبوونی ژمارەی مردووان «چیتر تەرمەکان یەک یەک نەدنێژران» و زیاد لە کەسێک لە گۆرێکدا دەنێژرا (Macpherson,1884). بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە مەککەدا ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە دروستبوونی پانەتای دووەم و تەشەنەسەندنی نەخۆشیەکە بە ژمارەیەکی زۆری ناوچەکانی جیهان. ئەم بڵاوبوونەوەیە بە هۆی ئەوەوە بوو کە ئەو حاجییانەی تووشی نەخۆشیەکە دەبوون لە مەککەوە دیانگواستەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان. کۆلێرا لە عەرەبستانی سعودییەوە گواسترایەوە بۆ هەر یەک لە سوریا، و فەلەستین و میسر و تونس و تورکیا و ڕۆمانیا و بولغاریا و پۆڵەندا. هەروەها لە ساڵی ١٨٣٢دا ٩٨ کەس لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا تووشی کۆلێرا بوون و ٩٦ کەسیان گیانی لەدەستدا.

هەر زوو پانەتاکە لەڕێی ئەو کەشتیانەی کە لە زەریای ئەتلەسیدا گەشتیان دەکرد گەیشتە ئەمریکا و لە ڕۆژی ٢٣ی حوزەیرانی ١٨٣٢دا

شـاری نیویۆرکـی گرتــەوە.

شـاری نیویـۆرک یەکێکـە لـەو شـوێنانەی کـە جێگەیەکـی باشـە بـۆ بڵابوونـەوەی کۆلێـرا بەهـۆی نزیکـی لـە زەریـاوە و هەروەهـا سـوێری ئـاوی ئـەو ڕووبـارەی کـە لـە دەوروبـەری گەڕەکـی مانهاتنـی شـارەکەدا دەڕوات.

وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پـێ کرد بەکتیریای کۆلێـرا حـەزی لـە ئـاوی سـوێرە و بۆیـە ئـاوی ئـەو ڕووبـارە ژینگەیەکـی ئایدیـال بـۆ بەکتیریاکـە دەرەخسـێنیت. هەروەهـا لـەو کاتـەدا، سیسـتمی تەندروسـتیی ئەمریـکا پێشـکەوتوو نەبـوو و پرنیسیپەکانی پاک و خاوێنـی و دەستشوشـتن... هتـد پەیڕەونەدەکرا. بۆیـە لـە مـاوەی تەنهـا ٢ هەفتـەدا کۆلێـرا لـە نیویۆرکـەوە گەیشـتە شـاری فیلادلفیـا و لەوێشـەوە بـە کەنارەکانـی زەریـاو و لەڕێـی کەشتیەکانەوە گەیشتە شـاری نیوئۆرلینـز. بـۆ مـاوەی زیاتـر لـە سـێ سـاڵ کۆلێـرا لـە ئەمریـکادا مایـەوە. کـە کۆتایـی پـێ هـات بـۆ مـاوەی ١٥ سـاڵ ڕووی لـە وڵاتەکـە نەکـردەوە.

لـە سـاڵی ١٨٣٥دا، پەتایەکـی تـری کۆلێـرا لـە مەککـەدا بڵاوبووەیـەوە. دوا بـە دوای ئـەو پەتایـە، کۆلێـرا هـەر زوو گەیشـتە ئـەو ناوچانـەی کـە حاجییەکانـی لێـوە دەهاتـن. هەروەهـا لـە هەمـان سـاڵدا، کۆلێـرا گەیشـتە ئوسـتراليا. دیسـانەوە لـە سـاڵی ١٨٤٦دا پەتایەکـی تـر لە مەککە بڵاوبوویەوە و بـووە هـۆی ئـەوەی کـە مـاوەی پانەتـای دووەم درێژبکاتـەوە. لـە ساڵەکانی ١٨٤٨ و ١٨٥٥دا، کۆلێـرا جارێکـی تـر لـە ئەمریـکا بڵاوبـووە. بـە کورتـی، پانەتـای دووەم بـە هەمـوو جیهانـدا بڵاوبـووەوە. جەمسـەری خـواروو تەنهـا شـوێنی جیهـان بـوو کـە کۆلێـرای تیـا بڵاونەبـووەوە.

چەنـد ڕووداوێکـی مێـژووی گرنـگ لـە سـاڵەکانی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە میانـی پانەتـای دووەم ڕوویانـدا. یەکێـک لـە ناسـراوترین ئـەو ڕووداوانـە لـە دواییـدا بـە ڕووداوی پەمپـی ئـاوی شـەقامی (بـرۆد)ی لەنـدەن لـە سـاڵی

١٨٥٤دا دەناسرێت. پزیشکێکی ناسراوی شاری لەندەن ئەو کات بە ناوی (جۆن سنۆ) لەڕێی ئەو ڕووداوەوە بۆی دەردەکەوێت کە کۆلێرا لەڕێی ئاوی پیسەوە دەگوازرێتەوە و هەروەها سەلماندی کە هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا تێکەڵبوونی ئاوی خواردنەوە و ئاوی زێرابی شارەکەیە.

جۆن سنۆ ئەو کات پزیشکی تایبەتی شازادە ڤیکتۆریا دەبێت (Colwell,1996). بۆ ئەوەی ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی هەرچی زۆرتری کۆلێرا بگرێت و نەخۆشیەکە کۆنترۆڵ بکات، جۆن سنۆ دەسکی پەمپی ئاوی ئەو گەڕەکانی لێکردەوە کە کۆلێرایان تیا بلاوبووەوە و لە ماوەیەکی کورتدا کۆلێرا بنبڕ بوو. هەرچەندە هەن دەڵێن کە ئەوەی جۆن سنۆ کردی نە دوور نە نزیک پەیوەندی بە بنبڕکردنی کۆلێراوە نەبوو و دەبێت هۆکارێکی تر هەبووبێت لە پشت ڕاگرتنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرێک لە زاناکان پێیان وایە کە جۆن سنۆ نەک تەنها توانی کۆلێرا بنبڕبکات، بەڵکو خزمەتێکی گەورەی مرۆڤایەتیشی کرد لەڕێی ئاشکراکردنی ئەو پەیوەندیە توندەی لە نێوان بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و ئاوی پیسدا هەیە. بۆ نموونە جۆن سنۆ ئاشکرای کرد کە لەو ١٠٠٠٠ماڵەی کە ئاوی خواردنیان لە دوو کۆمپانیا بە ناوی ڤاوکسهاڵ و ساوپوارکەوە وەردەگرت لە نێوان ١٨٥٤/٧/٨ تا ١٨٥٤/٨/٢٦دا ٣١٥ کەسیان تووشی کۆلێرا بوو. لە کاتێکدا تەنها ٣٧ کەس لەو ماڵانەی کە ئاوی خواردنەوەیان لە کۆمپانیایەک بە ناوی لامبێپەوە وەردەگرت تووشی نەخۆشیەکە بوون لە هەمان ماوەدا. ئەم کارەی جۆن سنۆ بۆ بەدواداچوونی ڕێژە و ژمارەکانی تووشبوون بە کۆلێرا و بەراوردکردنی ئەو ژمارانە بە سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوە سەرەتایەکی بەهێز بوو بۆ دروستبوونی زانستێکی سەربەخۆ بەناوی (Epidemiology) کە جۆن سنۆ بە باوکی ئەو زانستە دەناسرێت.

هـەر لـە سـاڵەکانی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە میانـی پانەتـای دووەم داهێنانێکـی زانسـتی گـەورە دۆزرایـەوە. زانـا ئەڵمانەکانـی ئـەو کات، بـۆ یەکـەم جـار هەوڵییـان دا کـە (مغـذی) لەڕێـی دەمـارەوە بـدەن بـەو نەخۆشـانەی کـە تووشـی کۆلێـرا بووبـوون. یەکەمیـن نەخـۆش کـە ئەمـەی لەگـەڵ تاقیکرایـەوە، تەنهـا نزیکـەی ٢٠٠ سیسـی ئـاوی وەرگـرت، بـەڵام زۆری نەبـرد گیانـی لـە دەسـتدا.

لـە دوو سـاڵی دوواتـردا، زاناکانـی بوارەکـە لـە هەوڵەکانیـان بـەردەوام بـوون بـۆ دەسـتکاریکردنی پێکهاتـەی ئـەو ئـاوەی کـە دەدرێت بـە نەخۆش بۆ ئـەوەی زیانـەکان کەمبکرێنـەوە و ژیانـی نەخۆشـەکە لـە مـردن ڕزگاربکرێـت. ئـەوە بـوو زانایەیکـی ئایرلەنـدی بـە نـاوی (ئۆشانسـی) بـە وردی لـە نەخۆشـیزانی کۆلێرای کۆڵیـەوە و گەیشـتە ئـەو دەرئەنجامـەی کـە دەبێت ئەو ئـاوەی کـە دەدرێـت بـە نەخۆشـەکانی کۆلێـرا هەمـان پێکهاتـەی ئـەو ئـاوەی هەبێـت کـە لـەش لـە ئەنجامـی نەخۆشـیەکە لـە دەسـتیدەدات. بـە مانایەکـی تـر، ئـەو زانایـە پێـی وابـوو کـە دەبێـت هەمـوو ئـەو شـلەمەنی و خوێیـەی کـە نەخۆشـی کۆلێـرا لـە دەسـتیدەدات لـە ڕێـی ئـاوەی مغذیـەوە بکرێتـەوە لەشـی نەخۆشـەکەوە. پزیشـکێکی خەڵکـی سـکۆتلاند بـە نـاوی (لاتـا) لـە نزیکـەوە ئـاگاداری کارەکانـی (ئۆشانسـی) بـوو و لـە سـاڵی ١٨٣٢دا، ئـاوی مغـذی لەڕێـی دەمـارەوەی بـۆ ١٥ نەخۆشـی کۆلێـرا بەکارهێنـا کـە خەریکبـوو گیانیـان لەدەسـتدەدا. پێنـج لـەو ١٥ نەخۆشـەی کـە ئاوەکەیـان وەرگـرت لـە مـردن ڕزگاریـان بـوو. یەکێـک لـە هـەرە بەناوبانگترین جۆرناڵە پزیشـکیەکانی ئەوسـا و ئێسـتاش (لانسـێت) ئـەم سـەرکەوتنەی (لاتـا)ی بـە شـۆڕش ناوبـرد و زۆر بـە گەورەییـەوە باسـی لێوەکـرد. بـەڵام بەداخـەوە، زۆربـەی پزیشـکە ناسراوەکانی ئـەو کاتـی بەریتانیـا و جیهـان پێیـان وابـوو چارەسـەری باشـتر و کاریگەرتـر لـەوەی کـە (لاتـا) دایهێنـا هەیـە. بـۆ نموونـە ئەوانـەی دوایـی جەختیـان لەسـەر چارەسـەرگەلێکی وەکـو بەردانـەوەی خوێنـی نەخۆشـەکە

و زیاتـر ڕشـانەوەی و پێدانـی دەرمـان بـۆ ئـەوەی سـکچوونی نەخۆشـەکە زیادبـکات وەکـو میکانیزمێـک بـۆ دەرهێنانـی میکرۆبەکـە و کۆتایـی هێنـان بـە نەخۆشـیەکە. ئـەم چارەسـەرانە بـە پێچەوانـەی ئـەوەی (لاتـا)ەوە بـە داخـەوە زەرەریـان لـە قازانجیـان زیاتـر بـوو و زۆربـەی جـارەکان دەبوونـە هـۆی مردنـی نەخۆشـەکە.

چارەسـەرکردنی کۆلێـرا لەڕێـی پێدانـی ئـاوی مغـذی بـە تەواوەتـی لـە بیـر کـرا تاوەکـو سـاڵی ١٨٩٠. لـەو سـاڵەدا پزیشـکێکی بەریتانـی بـە نـاوی (رۆجـەرز) لـە کەلکەتـای هینـد دیسـان چارەسـەرەکەی تاقیکـردەوە. ئـەو پزیشـکە هەندێـک لـە پێکهاتەکانـی ئاوەکەی دەسـتکاری کرد و سـەرکەوتنێکی گـەورەی بەدەسـتهێنا لـە کەمکردنـەوەی ژمـارەی ئەوانـەی کـە بـە کۆلێـرا دەمـردن. لـە نێـوان ساڵەکانی ١٩٠٥ بـۆ ١٩١٠دا، ڕێـژەی مـردن بـە کۆلێـرا لەوانـەی کـە ئـاوی مغذییـان بـە دەمـار وەردەگـرد لـە ٦٥٪دا دابـەزی بـۆ تەنهـا ٣٠٪دا. لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٩٥٨ و ١٩٦٤دا، ئـاوی مغـذی زیاتـر پـەرەی پێـدرا و لـە هەنـدێ شـوێندا، ئەنتیبایوتیکیشـی تـێ کـرا و بـووە هـۆی کەمکردنـەوەی ڕێـژەی مـردن بـە کۆلێـرا بـۆ تەنهـا ١٪دا. ئـەم پەرەسـەندنە پۆزەتیڤانـە وای کـرد کـە زانـاکان زیاتـر بیـر لـە پەرەپێدانـی ئـەو چارەسـەرە بکەنـەوە و ئـەوە بـوو لـە شەسـتەکان و حەفتاکانـی سـەدەی بیسـتدا، ئـاوی مغـذی لەڕێـی خواردنـەوەوە داهێنـراو و ئـەو چارەسـەرە شۆرشـێکی گـەورەی لـە سـکچوون و ڕشـانەوەی منداڵانـدا هێنایەکایـەوە.

لـە پـاڵ ئـەو داهێنـان و دۆزینـەوە زانسـتیە گەورانـەی لـە سـاڵەکانی پانەتـای دووەمـدا ڕوویانـدا، ئـەو پانەتایـە بـووە هـۆی ئەنجامدانـی یەکەمیـن زنجیـرە کۆبوونەوەیەکـی جیهانیـی بـۆ هەماهەنگـی لـە بـواری تەندروسـتییدا. کۆلێـرا بـۆ خـۆی تاقـە پاڵنـەری ئەنجامدانـی ئـەو کۆبوونەوانـە بـوو و تەندروسـتیی لـە کێشـەیەکی لۆکاڵـی بچووکـەوە گواسـتەوە بـۆ کێشـەیەکی

جیهانیی گەورە کە پێویستی بە هەماهەنگی هەمەلایەن و فراوان هەبێت. تەنها لە نێوان ساڵەکانی ١٨٥١ و ١٩٣٨دا، چواردە کۆنفرانس و کۆبوونەوەی جۆراجۆری جیهانیی دەربارەی پاکوخاوێنی و پاراستن لە کۆلێرا و نەخۆشیە گواستراوەکانی تر بەسترا. ئەم کۆبوونەوە و کۆنفرانسانە رۆڵێکی بەرچاویان بینی لە بەرەوەپێشەوەبردنی ئاستی تێگەیشتنی زانستی لە نەخۆشیەکە و هەروەها لە باشترکردنی ئاستی پاکوخاوێنی و هەبوونی ئاوی پاکی خواردنەوە لە جیهاندا و لە ئەنجامیشدا کەمکردنەوەی رێژەکانی تووشبوون بە کۆلێرا. وەکو لە خوارەوە لە پەیوەند بە پانەتاکانی ترەوە باسی دەکەین، کۆلێرا تەنها لەو ناوچانە مایەوە کە دواکەوتن لە پابەندبوون بەو ستانداردە نێودەوڵەتیانەی کە لەرێی ئەو کۆنفرانس و کۆبوونەوانەوە دارێژراو پەتاکە تەنها لەو شوێنانە مایەوە کە ئاستێکی نزمی ستانداردەکانی ئاوی پاکی خواردنەوە و پاک و تەمیزی تێدا هەیە.

## پانەتای سێهەم (١٨٥٢- ١٨٥٩):

پانەتای سێهەم لە ساڵی ١٨٥٢ەوە دەستی پێکرد و لە نێوان ساڵەکانی ١٨٥٣ و ١٨٥٤دا گەیشتە لوتکەی بڵاوبوونەوەی خۆی بەتایبەتی لە بروسیا، میزوپۆتامیا، باکوری ئەورووپادا، ئینگلترا، و ئەمریکا، مەکسیک، ئیندیزی رۆژئاوا، کۆلۆمبیا و کەنەدا. سەربازە فەرەنسیەکان بە فراوانی و توندی تووشی پەتاکە بوون بە تایبەتی لە ساڵەکانی دووەم و کۆتایی شەڕی (قرم)ی نێوان ساڵەکانی ١٨٥٣ و ١٨٥٦. ئەو سەربازانەی تووشی پەتاکە بوون لەگەڵ خۆیاندا گواستیانەوە بۆ تورکیا، و یۆنان و عەرەبستان و سوریا و سودان و میسر و ئیتالیا و بەرازیل و ئەرجەنتین و سویسرا و نەمسا و دواتر بۆ ئیسپانیا و پورتوگالیش. دواجار ئەم پانەتایە بە

ئاسـیا و ئەفریقیـا و تەنانـەت باکـوری ئیسـکەندناڤیاش بڵاوبـووەوە. لـە میانـی پانەتـای سیهەمدا، زانایەکـی ئیتاڵـی بـە نـاوی (فیلیپـو پاسـینی) دۆزینەوەیەکـی گرنگـی ئاشـکرا کـرد. لـە کاتـی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا بـە ناوچـەی (تۆسـکانی) لـە ئیتاڵیـادا، ئـەم زانایـە پێکهاتـەی ریخۆڵـەی ئـەو نەخۆشـانەی پشـکنی کـە تووشـی کۆلێـرا بووبـوون و ئـەو بەکتیریایـەی دۆزیـەوە کـە ئێسـتا پـێ دەوترێـت (Vibro Cholera) و هـۆکاری نەخۆشـی کۆلێرایـە. لـە کاتـی خۆیدا دۆزینەوەکـەی (پاسینی) زۆر گرنگـی پـێ نـەدراو دواتـر زانایەکـی تـر بـە نـاوی (رۆبـرت کـوخ) بـۆ جارێکـی تـر دۆزیـەوە. هەرچەنـدە (پاسـینی) یەکەمیـن کەسێک بـوو کـە بەکتیریـای کۆلێـرای بینی، بـەڵام زۆرێـک لـە جیهانـدا بـەم دۆزینەوەیـە ئاشـنا نەبـوون چونکـە تواناکانـی (پاسینی) لـەو کاتـەدا سـنووردار بـوون بـۆ بەرجەسـتەکردنی پەیوەندیەکـی راسـتەوخۆ لـە نێـوان بەکتیریاکـە و نەخۆشـیەکە. بـەڵام دواتـر (کـوخ) توانـی لەرێـی ئـەو ئامـرازە زانسـتیانەی لـە بەردەسـتیدا بـوون، ئـەو پەیوەندییـە ئاشـکرا بـکات و بەکتیریاکـە وەکـو هـۆکاری نەخۆشـی کۆلێـرا بناسـێنێت.

## پانەتای چوارەم (١٨٦٣-١٨٧٩):

لـە میانـی ئـەم پانەتایـەدا، پەتایەکـی کۆلێـرای تونـد لـە سـاڵی ١٨٦٥دا لـە مەککـە بڵاوبـووەوە. لـە نێـوان ٩٠٠٠٠ حاجـی کـە سـەردانی مەککەیـان کردبـوو، نزیکـەی ٣٠٠٠٠یـان بەهـۆی کۆلێـراوە گیانیـان لـە دەسـتدا. ئـەو حاجیانـەی کـە لـە مـردن رزگاریـان بـوو، کۆلیرایان لـە گەڵ خۆیان گواسـتەوە بـۆ ئەوروپـا و ئەفریقیـا. بـە هـۆی ئـەو جەنگـەی کـە لـە نیـوان ئیتاڵیـا و نەمسـا لـە لایـەک و ئەڵمانیـا و نەمسـادا لـە لایەکـی تـرەوە هەبـوو، کۆلێـرا زیاتـر لـە ئەوروپـادا بڵاوبـووەوە. تەنهـا لـە سـاڵی ١٨٦٦دا، ٨٠٠٠٠ کـەس لـە نەمسـا و ١١٥٠٠٠ لـە ئەڵمانیـا، ١١٣٠٠٠ لـە ئیتاڵیـا و ٩٠٠٠٠ لـە رووسـیا

بە هۆی کۆلێراوە مردن. دوای ساڵێک، ۱۱۳۰۰۰ی تر لە ئیتاڵیا گیانیان لە دەستدا. لە ساڵی ۱۸٦۸دا، پەتاکە لە ئەفریقیا و ئەوروپادا نزیکەی کۆتایی هات. لەو کاتەدا، هێشتا تەندروستیی و پاک و تەمیزی لە ئەمریکا لە دۆخێکی خراپدا بوون، بۆیە لە ساڵی ۱۸٦٥دا، نەخۆشییەکە گەیشتە ئەو وڵاتە و لە شاری نیۆرکەوە دەستی پێکرد. بەڵام جیاواز لە پانەتاکانی پێشوو، پەتایەکی بەربڵاو لەو ساڵەدا ڕووی نەدا. پەتاکە دواکەوت تا ساڵی ۱۸٦٦ کە لە نیۆرکەوە و لەڕێی شەمەندەفەرەوە گواسترایەوە بۆ ویلایەتی کەنساس و لەوێشەوە بە پاپۆڕ گواسترایەوە بۆ ئەتلانتیک سیتی و دواتر بۆ نیوئۆرلینز لە ویلایەتی لویزیانا.

پەتای کۆلێرا لە میانی پانەتای چوارەمەدا، لە ساڵی ۱۸۷۲ گەیشتە هەنگاریا و لە دوو ساڵی داهاتوودا نزیکەی ۱۹۰۰۰۰ کەس گیانیان لە دەستدا. لە ساڵی ۱۸۷۲دا جارێکی تر پەتاکە لە مەککە بڵاوبووەوە و ئەو حاجیانەی کە لە نەخۆشیەکە ڕزگاریان بوو پەتاکەیان گواستەوە بۆ تورکیا و میزوپۆتامیا و عەرەبستان و میسر و ڕووسیا و سودان و سوریا و ئاسیای باشوری ڕۆژهەڵات و دوورگەکانی دەروبەر.

## پانەتای پێنجەم (۱۸۸۱-۱۸۹٦):

پانەتای پێنجەم لە نێوان ساڵەکانی ۱۸۸۱-۱۸۸۲دا لە مەککەدا دەستی پێکرد. لەوێوە، پەتاکە بە میسردا بڵاوبووەوە. لە شاری ئەسکەندەرییەی ئەو وڵاتە بوو، کە (ڕۆبەرت کوخ) بۆ جارێکی تر سەلماندی کە بەکتیریای (Vibro Cholera) هۆکاری نەخۆشی کۆلێرایە. کوخ ناوی لە بەکتیریاکە نا (Komma bazillen)، دەکرێت ئەو سەلماندنەی (کوخ) بە کۆتا دۆزینەوە بناسێنین لە بواری هۆکاری نەخۆشی کۆلێرادا، چونکە ئەم زانایە ئەوەندە بە دوور و درێژی

باسـی نەخۆشـیەکە و هۆکارەکـەی کـرد کـە هیـچ بوارێکـی بـۆ کەسـێکی تـر نەهێشـتەوە کـە شـتی تـری لەسـەر بنووسـێت. لـە میانـی پانەتـای پێنجەمدا، (کـوخ) ناوبانگێکـی گـەورەی بـۆ خـۆی بـردەوە. بڵاوبوونـەوەی ناوبانگـی (کـوخ) دەکرێـت بـۆ چەنـد هۆکارێکـی سـەرەکی بگەڕێنینـەوە؛ یەکیـان ئـەوە بـوو کـە ئـەم زانایـە دیسـان سـەلماندی کـە ئـەو بەکتیریایـەی لـە شـکڵی (کۆمایە) هـۆکاری نەخۆشـی کۆلیرایـە. هەروەها (کـوخ) کۆمەڵێـک دۆزینـەوەی تـری ئاشـکرا کـرد کـە بـە شـێوەیەکی سەرسـوڕهێنەر ڕاسـتبوون دەربـارەی خەسـڵەتە بایۆلۆژیەکانـی نەخۆشـیەکە. کـوخ دەیگـوت، کـە هەبوونـی ژمارەیەکـی زۆری بەکتیریـای کۆلێـرا لـە نـاو ڕیخۆڵـەی ئەوانـەی کە تووشـی نەخۆشـیەکە بـوون و هـاوکات نەبوونـی هیـچ برینێـک لـە دیـواری ڕیخۆڵەکانـدا، بەڵگەیـە لەسـەر ڕژاندنـی ژەهرێکـەوە لـە لایـەن بەکتیریاکـەوە، کـە هـۆکاری نیشـانەکانی نەخۆشـیەکەیە. هەروەهـا (کـوخ) یەکێـک بـوو لـە یەکەمیـن ئـەو زانایانـەی بـڕوای بـەوە هەبـوو کـە تێگەیشـتنی زانسـتیانە لـە بەکتیریاکـە بنەمـای کۆنترۆڵکردنـی نەخۆشـیەکەیە. ئـەو لـە یەکێـک لـە نووسـینەکانیدا دەڵێـت:

" لـە تەقـەلای خۆمانـدا دژی ئـەم دەردە، ئاسـانە گریمانـەی ئـەوە بکەیـن کە لـە بنەمایەکـی زانسـتیانەی ڕوونـەوە دەسـتپێدەکەین، بـەڵام بـە داخـەوە زۆرجـار ئەمـە دۆخەکـە نیـە، بـە تایبەتـی لەمـەڕ کۆلێـرا کـە ئـەو بنەمایـە زانسـتیە بوونـی نیـە".

هەروەها (کـوخ) بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە گۆڕانـکاری لـە هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان، ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە سنووردارکردنی بڵاوبونەوەی نەخۆشـیەکە. بۆ نموونـە ئـەو پێشـنیاری ئـەوەی دەکـرد کـە فراوانبوونـی هاموشـوو و جوڵـەی خەڵـک بـە تایبەتـی لـە کۆتاییەکانـی سـەدەی نـۆزدەدا، ڕۆڵێکـی گـەورەی هەبوو لـە بڵاوبوونـەوەی زیاتـری پەتاکـە و دواجـار جێگیربوونـی وەکـو نەخۆشـیەکی

بەردەوام و درێژخایەن لە هەندێ ناوچەی جیهاندا، جیاواز لە زۆرێک لەو زانایانەی کە هاوزەمانی بوون، (کوخ) بڕوای وا بوو کە ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە تووشی کۆلیرا دەبن، بە بێ نیشانە دەمێننەوە و نیشانەکانی نەخۆشیەکە لێیان دەرناکەوێت. ئەو پێی وابوو کە ئەوانەی بە توندی تووشی نەخۆشیەکە دەبن ژمارەیەکی کەمی ئەوانەن کە هەڵگری بەکتیریاکەن. بەڵام ئەوانەی کە هەڵگری بەکتیریاکەن و هیچ نیشانەیەکیان تیا دەرناکەوێت یا نیشانەکانیان بە سووکی تیا دەردەکەوێت، بەردەوام دەبن لە دەردانی بەکتیریاکە و دەبنە سەرچاوەیەکی گەورەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە. ئەم بۆچوون و بەڵگانەی (رۆبەرت کوخ) تاوەکو ساڵەکانی ١٩٨٠یش بە جیددی وەرنەگیران و تەنها لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستدا ڕاستی و دروستی زۆرێک لەو بۆچوونانە بە بەڵگەی زانستی پتەو سەلمێنران.

لە میانی پانەتای پێنجەمدا، نیوەی ئەو کەسانەی لە ئەوروپا تووشی پەتای کۆلێرا بوون گیانیان لە دەستدا. ئەم ئاستە بەرزەی ڕێژەکانی مردن بە نەخۆشیەکە، کەرەستەیەکی بەهێزی بەخشیە بەرپرسانی تەندروستیی لە وڵاتەکانی ئەوروپا بۆ جێبەجێکردنی داواکارییەکانیان بە هێنانەکایەی سیستمێکی تەندروستیی. بەشێکی زۆری ئەو داواکارییانە لە کۆمەڵێک گۆڕانکاری سەرکەوتووەوە سەرچاوەیان گرتبوو کە لە بریتانیا لەڕێی (بینجامین دیزرائیلیەوە) ئەنجامدرابوون. ئەو گۆڕانکارییانە سەرکەتوو بوون لە بنبڕکردنی کۆلێراو دوا کەیسی نەخۆشیەکە لە ساڵی ١٨٩٣دا لە لەندەن تۆمارکرا.

لە میانی پانەتاکەدا و لە ساڵەکانی ١٨٨٧ و ١٨٩٢دا، کۆلیرا دیسان گەیشتەوە ئەمریکا. بەڵام ژمارەیەکی کەمتر لە هاوڵاتیان تووشی پەتاکە بوون، چونکە شارەکانی ئەو وڵاتە لە ڕووی پاککردنەوەی سەرچاوەکانی ئاو و گرنگیدان بە پاکوخاوێنی پێشکەوتنێکی بەرچاویان بە خۆیانەوە

بینـی بـوو. بـەڵام پەتاکـە بـە تونـدی و بەربـڵاوی لـە ئەمریـکای باشـور و ئەوروپـادا بڵاوبـووەوە و بـە تایبەتـی شـارەکانی مۆسـکۆ و سـانت بترسـبۆرگ گرتــەوە. تەنهـا لــەو دوو شــارەدا و لەنێــوان ســاڵەکانی ١٨٩٣ و ١٨٩٤دا، ٨٠٠٠٠ کـەس بـە کۆلێـرا گیانیـان لـە دەسـتدا. پانەتـای پێنجـەم، ئەفریقیـا و ئاسیایشـی گرتـەوە، بـە فلیپیـن و یابانـەوە. تەنهـا لـە یابـان لـەو ماوەیـەدا، نزیکـەی ٣٤٠٠٠٠ کـەس بـە کۆلیـرا گیانیـان لـە دەسـتدا.

## پانەتای شەشەم (١٨٩٩-١٩٢٣):

پانەتــای شەشــەم، وەکــو زۆرێــک لــە پانەتاکانــی پێشــوو، لــە مەککــەی عەرەبســتانی سـعودییەوە دەسـتی پێکـرد. پەتایەکـی تونـد لـە سـالێ ١٩٠٢ مەککــەی پیــرۆزی گرتــەوە. ئــەو حاجییانــەی کــە تووشــی کۆلێــرا بــوون، نەخۆشـیەکەیان بـۆ وڵاتەکانـی دەوروبـەر و بـە تایبەتـی بـۆ میسـڕ گواسـتەوە. هەرچەنــدە ئــەو وڵاتــەی دوایــی هەوڵــی کۆنترۆڵکردنــی نەخۆشــییەکەی دا، بـەلام لـەوەدا سـەرکەوتوو نەبـوو. لـە میسـرەوە پەتاکـە گواسـترایەوە بـۆ هەر یەکـە لـە ئیتاڵیـا و هەنگاریـا و بەلقـان و یۆنـان. دوای دە سـاڵ و لـە ١٩١٢دا، جارێکـی تـر کۆلێـرا لـە مەککـەدا بڵاوبـووە. هەرچەنـدە ئـەو شـارە دوای ئـەم پەتاییـەی دوایـی لـە کۆلێـرا ڕزگاری بـوو، بـەڵام جەنگـی جیهانیـی یەکـەم دۆخێکـی لەبـاری بـۆ دووبـارە بڵاوبوونـەوە و تەشەنەسـەندنی نەخۆشـیەکەی هێنایەکایـەوە.

لــە ســاڵی١٩١٠دا، کەشــتیە بازرگانیــەکان کۆلێرایــان لــە ڕووســیاوە گواســتەوە بــۆ ئەفریقیــای باشــور. هەروەهــا لــە میانــی ئــەم پانەتایــەدا، کۆلێـرا بـە ناوچەکانـی ئاسـیای ڕۆژهـەڵات و مالیزیـادا بڵاوبوونـەوە. دوا پەتای کۆلێـرا لـە ئەمریـکا لـە میانـی پانەتـای شەشـەمدا تۆمارکـرا لـە سـاڵی ١٩١١دا و دوای ئــەوە هیــچ پەتایەکــی تــازە لــەو وڵاتــەدا تۆمــار نەکــراوە.

## كۆلێرا لە نێوان ساڵەكانی (١٩٢٦-١٩٦٠):

زۆرێک لە شارەزایان پێیان وابوو کە دوای کۆتایی هاتنی پانەتای شەشەم، ئیتر کۆلێرا ناگەڕێتەوە. لە ڕاستیدا زۆرێک لەو وڵاتانەی کە پێشتر کۆلێرایان لێ نەدەبڕا، کەمتر لە جاران پەتاکەیان تێیدا بڵاودەبووە. بۆ نموونە دوا ڕووداوی بڵاوبونەوەی پەتای کۆلێرا لە ئەورووپا کە سەرچاوەی نەخۆشییەکە لە خودی ئەورووپاوە سەریهەڵدابێت، لە ساڵی ١٩٢٥دا تۆمار کرا. هەروەها لە ساڵی ١٩٥٧دا لە هۆنگ کۆنگ دوا پەتا تۆمار کراو و لە مالیزیا و فلیپپینش لە ساڵی ١٩٣٧ و لە میسر لە ساڵی ١٩٤٧دا.

دیارە بەشی زۆری ئەم کەمبوونەوە لە ڕێژەکانی ڕوودان و بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بۆ پابەندبوون بە پرنسیپەکانی پاک و خاوێنی و گرنگیدان بە ئاوی پاکی خواردنەوە و دەستشوشتنەوە ڕوویاندا. هەروەها لەو ماوەیەدا یەکێک لە هەرە گرنگترین دۆزینەوە زانستیەکانی تایبەت بە کۆلێرا ئاشکرا کران کەلە ساڵی ١٩٥٣دابوو، دەستنیشانکردنی ئەو ژەهرەبوو کە بەکتیریای کۆلێرا دەیرێژێت و هۆکاری زۆربەی نیشانەکانی نەخۆشییەکەیە. لە پاڵ ئەم دۆزینەوەیە وپابەندبوون بە پرنسیپەکانی پاک وخاوێنی،

بەرەوپێشەوەچوونی بەرچاو لە کاریگەرییەکانی چارەسەرکردنی نەخۆشیەکە و بەکارهێنانی ئەنتیبایۆتیکیش ڕوویاندا.

ئەم فاکتەرانە تێکڕا کاریگەری گەورەیان هەبوو لەسەر کەمکردنەوەی ڕێژەکانی تووشبوون بە نەخۆشیەکە و دواجاریش کەمکردنەوەی ڕێژەکانی مردن.

## پانەتای حەوتەم (١٩٦١-ئێستا):

ئـەم پانەتایـە لـە سـاڵی ١٩٦١ەوە دەسـتی پێکـرد و ئیستاشـی لـە گەڵدابێت هـەر بەردەوامـە. پانەتاکـە شـەش کیشـوەری گرتۆتـەوە. ئـەم پانەتایـە جیاوازییەکـی گرنگـی هەیـە لـە گـەڵ پانەتاکانـی تـر، چونکـە جـۆری ئـەو بەکتیریایـەی لـەم پانەتایـە بڵاوبـۆوە جیـاوازە لەوانـەی پێشـوو. ئـەو جـۆرەی پانەتـای حەوتەمـی دروسـتکرد پێـی دەوترێـت (ئیـل تـور)، خۆشـبەختانە ئـەو نیشـانانەی کـە ئـەم جـۆرەی کۆلێـرا تووشـی نەخۆشـەکەی دەکـەن، سـووکترن. سـووکی ئـەو نیشـانانەی کـە بەکتیریاکـە دروستی دەکات، وای لـە هەندێـک پسـپۆرو شـارەزای بوارەکـە کردبـوو کـە گریمانـەی ئـەوە بکـەن کـە ڕەنگـە ئیـل تـور نەبێتـە هـۆی بڵاوبوونـەوەی پانەتـا و تەنهـا ببێتـە هـۆی بڵاوبوونـەوەی پەتایەکـی کـەم و سـنووردار. بـەڵام بـە پێچەوانـەی ئـەو پێشـبینیانەوە، ئیـل تـور بـووە هـۆی بڵاوبوونـەوەی پانەتـای حەوتـەم و یەکەمیـن شـوێنێک کـە پانەتاکـەی تێیـدا دەسـتیپێکرد جافـای ئەندەنووسـیا بـوو لـە سـاڵی ١٩٦١.

پانەتـای حەوتـەم بەسـێ قۆناغـی دیاریکـراودا تێپـەڕی. قۆناغـی یەکـەم لـە سـاڵی ١٩٦١ەوە دەسـتی پێکـرد ولـە سـاڵی ١٩٦٦ کۆتایـی پێهات. قۆناغی دووەم لـە ١٩٧٠ دەسـتیپێکرد و لـە ١٩٧١ کۆتایی هـات. هەرچـی قۆناغـی سـێهەمە، لـە سـاڵی ١٩٩١ەوە دەسـتیپێکرد و تـا ئێسـتا بەردەوامـە. وەکـو لەسـەرەوە باسـمان کـرد، پانەتاکـە لـە ئەندەنوسـیاوە سـەرچاوەی گـرت و لـە سـاڵی ١٩٦٦دا گەیشـتە ڕووسـیا و عێراقیشـی گرتـەوە. پەتـای کۆلێـرا لـەو وڵاتانـە بڵاوبـۆوە، بـەڵام لـە نێـوان ساڵەکانی ١٩٦٦ و ١٩٧٠ بڵاوبوونەوەکـە خاوبوونـەوەی بـە خۆییـەوە بینـی. لـە سـاڵی ١٩٧١ دیسـان پەتـای کۆلێـرا بـە خیرایـی لـە ئەفریقیـا و سـنوورەکانی

باشووری ئەورووپا بڵاوبۆوە. هەروەها پەتاکە بە بەربڵاوی لە ڕۆژئاوای ئەفریقیاش بڵاوبوویەوە. ئەم بڵاوبوونەوەی پەتاکە لەو ناوچەیە جێگەی سەرنجی زانایان بوو، چونکە لە پانەتاکانی پێشتر، کۆلێرا لەو ناوچەیە بە کەمی بڵاوببوویەوە. هەر بۆیەش وا دەزانرا کە کەش و هەوای ئەو ناوچانە جۆرێک لە بەرگری دروستدەکات دژی کۆلێرا. بەڵام جۆرە تازەکانی کۆلێرا زۆر بە خێرایی لەو ناوچانە بڵاوبوونەوە. بۆ نموونە لە ماوەی تەنها چوار مانگدا، کۆلێرا لە ١١ وڵاتی ڕۆژئاوای ئەفریقیا بڵاوبووەوە، لە هەفتاکانی سەدەی ڕابووردووشدا لە سەرەتای سەرهەڵدانی پانەتاکە ڕێژەی ئەوانەی کە دەمردن لە ڕۆژئاوای ئەفریقیادا نزیکەی ٥٠٪بوو. بەڵام ئەو ڕێژانە لەگەڵ بەکارهێنانی چارەسەر و باشتربوونی کاریگەریەکانی ئەو چارەسەرانە بۆ نزیکەی ٥٪ کەمبۆوە.

لە ساڵی ١٩٧٤، بۆ جارێکی تر پەتای کۆلێرا لە مەککەدا بڵاوبووەوە. هەرچەندە پەتاکەی ئەو جارەیان لە جارەکانی تر سووکتر بوو، بەڵام ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆری هێنایە کایەوە. ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە سەیر نەبوو ئەگەر ڕێژەی مردن و خێرایی بڵاوبوونەوە و قورسی ئەو پەتایانە بهێنینەوە یادی خۆمان کە کۆلێرا لە بۆنەکانی تردا دروستیکردبوو. لە ساڵی ١٩٧٤دا، تەنها ٩٠ کەس تووشی کۆلێرا بوو لە کۆی ١ ملیۆن حاجی.

هەر لە ساڵی ١٩٧٤دا، وڵاتی پورتوگالیش تووشی پەتایەکی بەربڵاوی کۆلێرا بوو کە نزیکەی هەموو وڵاتەکەی گرتەوە. دوای ٤ ساڵ لەو پەتایە، کۆلیرا دیسان لە چەند ولاتێکی ئەفریقیا سەریهەڵدایەوە و وڵاتەکانی بورۆندی و کۆنگۆ و ڕواندا و زائیر و زامبیای گرتەوە. ئێستاشی لەگەڵدا بێت زائیر زۆربەی ساڵەکان پەتایەکی کۆلێرا بە

خۆیـەوە دەبینێـت.

دەبێـت ئـەوە بووترێـت کـە بەشـێک لـەو وڵاتانـەی کـە کۆلێرایـان تێـدا بڵاودەبێتـەوە، بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـییەکە لـە دەزگا تەندروسـتییە جیهانییـەکان دەشـارنەوە.

ئـەو کارە بـۆ ئـەوە دەکـەن چونکـە بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا بـۆ خـۆی نەنگیەکـی گەورەیـە بـۆ سیسـتمی تەندروسـتیی و تەنانـەت دەسـەڵاتداری سیاسـی ئـەو وڵاتـە و هەروەهـا بڵاوبوونـەوەی پەتاکـە کاریگەریەکـی نەگەتیڤـی گـەورەی هەیـە لەسـەر ئاڵوگـۆڕی ئابـووری و بازرگانـی.

لـە میانـی پانەتـای حەوتـەم و بـە دیاریکـراوی لـە ساڵەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا، پیشـکەوتنێکی زانسـتی گـەورە ڕوویانـدا لـە شـێواز و کاریگـەری چارەسـەرکردنی کۆلێـرا. لـەو سـاڵانەداو بـە هـۆی گەشـەکردنی تێگەیشـتنی زانایـان لـە بنەمـا فسـیۆلۆژیەکانی گواسـتنەوەی ئـاو و خوێـکان لـە نـاو ڕیخۆڵـەدا، پێشـکەوتنێکی بەرچـاو لـە پێکهاتـەی ئـەو چارەسـەرە کاریگـەرە هاتـە کایـەوە کـە بـۆ کۆلێـرا بەکاردەهێنـرا. ئـەوەی پێـی دەوترێـت (Oral Rehydration Therapy ORS) بـەو پێکهاتـە و شـێوازەی ئێسـتای، لـە حەفتاکانـی سـەدەی ڕابـووردوودا دروسـتکرا و بڵاوبـووەوە.

قۆناغـی سـێیەمی پانەتـای حەوتـەم لـە مانگـی یەکـی سـاڵی ١٩٩١دا لـە پیـرۆی ئەمریـکای باشـور بڵاوبـووە. لـە سـاڵی ١٨٩٥ەوە هیـچ پەتایەکـی کۆلێـرا لـە ئەمریـکای باشـور ڕووینەدابـوو و مشـتومڕێکی زۆر هەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئایـە چـۆن کۆلێـرا گواسـترایەوە بـۆ ئـەو کیشـوەرە. پەتاکـەی سـاڵی ١٩٩١، لـە یـەک کاتـدا لـە چەنـد شـوێنێکی جیـاوازی ئـەو وڵاتـە سـەریانهەڵدا، بۆیـە زۆرێـک لـە زانایـان جەختیـان لەسـەر ئـەو تیـۆرە کـردەوە کـەوا بەکتیریـای کۆلێـرا بـۆ خـۆی لـە ژینگـەی وڵاتەکـەدا نیشـتەجێیە و لـە کات و سـاتی گونجـاودا سـەرهەڵدەداتەوە و دەبێتـە

هۆی بڵاوبوونەوەی پەتای فراوان. دوای ئەوەی لە پیرۆ بۆ یەکەم جار سەریهەڵدا، پەتاکە ئەو ڕێگایانەی گرتە بەر کە پێشتریش ناسراوبوون.

بۆ نموونە لە پیرۆوە کۆلێرا گواسترایەوە بۆ مەکسیک و ئەم گواستنەوەش بەهۆی پەیوەندی بازرگانی و ڕێگاوبانی بەکارهێنراو بۆ ئەو ئاڵوێرانەوە بوو. لە مانگی دووی ١٩٩٢، ئیتر کۆلێرا گەیشتە ١٨ وڵات لە وڵاتەکانی ئەمریکای باشور. زۆربەی زاناکان پێیان وایە کە دەشێت کۆلێرا لە زۆرێک لە وڵاتەکانی ئەمریکای باشور بمێنێتەوە چونکە ژینگە و ئاو و هەوای ئەو کیشوەرە زۆر گونجاوە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە. لە پاڵ وڵاتەکانی ئەمریکای باشوور، چەند وڵاتێکی ئەفریقایش تووشی پەتای کۆلێرا بوو.

بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بەو وڵاتانەی کە پێیان دەوترا وڵاتانی جیهانی سێهەم، شارەزایان و پسپۆرەکانی لە گرنگی خۆ ئامادەکردن بۆ سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی کۆلێرا ئاگادارکردەوە. بۆیە لە کاتی بڵاوبوونەوەی هەواڵی کۆلێرا، زۆرێک لەو وڵاتانە و بە یارمەتی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیە پسپۆرەکانی ئەو بوارە، خۆیان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پەتاکە ئامادە دەکەن. ئەم خۆ ئامادەکردنە خۆی لە ئەنجامدانی خولی هۆشیاری و گرنگی دان بە پاک و خاوێنی و دڵنیابوون لە پاکی ئاوی خواردنەوە و بەکارهێنانی ORS.

دوای ئەم گێڕانەوە کورتەی مێژووی کۆلێرا لە جیهاندا، کاتی ئەوە هاتووە چاوێک بە دووریە مێژوویەکانی ئەم پەتایە بخشێنین لە عێراق و کوردستاندا. سەرەتا بە مێژووی کۆلێرا لە عێراقدا دەچینەوە و دواتریش بە پێی بەردەستیی سەرچاوەکان باسی مێژووی کۆلێرا لە کوردستاندا دەکەین.

## مێژووی کۆلێرا لە عێراق:

شوێنی جوگرافی عێراق لەسەر ڕێگای هاتوچۆی حاجیەکانی مەککە و هەروەها سەردانی ژمارەیەکی زۆری موسڵمانانی شیعە مەزهەب بۆ کەربەلا و نەجەف و مەزارگە پیرۆزەکانی مەزهەبەکە وایان کردووە کە عێراق شوێنێکی نموونەیی بێت بۆ بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و بەردەوامبوونی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە لە مێژووی کۆن و تازەی ئەم وڵاتەدا. توێژینەوەکان پێشبینی ئەوە دەکەن کە بۆ یەکەم جار کۆلێرا لە ساڵی ١٨٢٠دا هاتبێتە عێراقەوە (Yousif,Hayya- ,2010 Khwaif &wi). د. علی الوردی، کۆمەڵناسی ناسراوی عێراقی باسی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لەو ساڵەدا لە بەسرەی باشوری عێراق دەکات (Al-Khoei & Al-Wardi ,2010) بەڵگەنامە مێژوویەکانیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان بە هۆی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لەو شارەدا گیانیان لە دەستدا. هەر لە هەمان ساڵدا، پەتاکە بەغدای پایتەختی گرتەوە و ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیانی تووشی نەخۆشی کرد.

بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە عێراقدا، تەنها بۆ وڵاتەکە خۆی مایەی دروستبوونی کێشە نەبوو، بەڵکو بۆ وڵاتەکانی دەوروبەریش کێشەی دروستکردووە و بەردەوامە لە دروستکردنی ئەو جۆرە کێشانە. بۆ نموونە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا و بە دیاریکراوی لە ساڵی ١٨٨٩دا کۆلێرا لە عێراق بڵاوبوویەوە. بۆیە شای ئەو کاتی ئێران (نەسرەددین شاهی قەجەر) فرمانی قەدەغەکردنی حەج بۆ مەزارە پیرۆزەکانی عێراق دەدات (Azizi MH,2009). بە هەمان شێوە و لە ساڵی ١٩٢٧دا، وەزیری ناوخۆی ئەو کاتی ئێران بڕیارێک بە

قەدەغەکردنی سەفەر بۆ عێراق دەردەکات بەهۆی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە شاری بەسرە لەو ساڵەدا.

لە دوای ساڵی ١٨٢٠، کە کۆلێرا لە بەسرەوە هەموو عیراقی گرتەوە، پەتای کۆلێرا کەمبویەوە و تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە عێراقدا بە توندی سەریهەڵنەدایەوە. لە ساڵی ١٩٦٦ بە دواوە کۆلێرا لە عێراقدا وەکو پەتایەکی چەسپیو مایەوە. لە ساڵی ١٩٦٦دا، ٢٢٧ کەس تووشی نەخۆشیەکە بوون و لەوانە ٢٠ کەسیان مردن (WHO,2010)

لە ماوەی٤٠ساڵی رابووردوودا، هەر پەتایەکی کۆلێرا ڕوویدابێت، بۆ ماوەی ٣ مانگ بەردەوام بووە و لە ساڵی دوای ڕوودانی پەتاکە شەپۆلێکی دووەم ڕوویداوە. لە زۆربەی جارەکانی پێشوودا، کۆلێرا لە پارێزگاکانی کوردستانەوە دەستی پێکردووە و پەلیشی هاویشتووە بۆ ناوچەکانی تری عێراق. بە لای کەمەوە ئەوە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییەوە پشتراستکراوەتەوە. تاوەکو ئێستا هیچ داتایەکی ئەوتۆ لە بەردەستدا نیە بۆ ئەوەی ڕوودانی کۆلێرا لەگەڵ گۆڕانی کەش و هەوادا بەراورد بکات.

لە کۆتاییەکانی سەدەی ڕابووردووەوە و بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٨٩ەوە، ژمارەی تووشبووان بە کۆلێرا لە خوارووی عیراق زیادیکرد. لە دوای داگیرکردنی کوێتەوە لە سالی ١٩٩٠ و دواتر لەجەنگی کەنداوی ساڵی ١٩٩١دا، کۆلێرا دیسانەوە بە خەستی لە عێراقدا سەریهەڵدایەوە. ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان لە نەوەدەکاندا تووشی کۆلیرا بوون (2010 Khwaif et al) لە ساڵی ١٩٩٨دا، زیاد لە ٢٥٦٠ کەس تووشی کۆلێرا بوون لە عیراقدا (WHO,2010) هەروەها لە ساڵی ٢٠٠٣دا، کۆی ١٨٧ کەس تووشی کۆلیرا بوون، بەڵام خۆشبەختانە کەسیان نەمردن. هەر لەو ساڵەدا، تیمێکی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی توێژینەوەیەکی

ئەنجامـداو بـۆی دەرکـەوت کـە یەکێـک لـە هـۆکارە سـەرەکییەکانی گواسـتنەوە و تووشـبوون بـە کۆلێـرا پیسـبوونی ئـاوی خواردنـەوە بـوو.

تەنها لـە سـاڵی ٢٠٠٢دا، ٢٥٧ کـەس لـە شـاری بەسـرە تۆمارکـران. بارودۆخـی نالەبـاری سیاسـی و ئابـوری وڵاتەکـە لـەو کاتـەدا، ڕۆڵێکـی گەورەیـان بینـی لـە بڵاوبونـەوەی نەخۆشـیەکە و قورسـیی و سـەرنەکەوتنی هەوڵەکانـی کۆنترۆڵکـردن و چارەسـەر (WHO,2003).

هاوکات لە سـاڵی ٢٠٠٣دا، ژمارەیەکی تری هاوڵاتیانی دانیشـتووی شـاری بەسـرە تووشـی نەخۆشـیەکە بـوون. بـە هـۆی ئـەوەی کـە پێداویسـتیەکانی تاقیکردنـەوە و پشـکنین بـۆ نەخۆشـییەکە لـە بەردەسـتدا نەبـوون، ئـەو سـامپڵانەی لـە نەخۆشـەکان وەردەگیـران، ڕەوانـەی کوێـت دەکـران و بۆیـە دەسـتنیشـانکردنی نەخۆشـییەکە زۆری خایانـد و چارەسەریشـی دوادەکـەوت (WHO,b2003).

لـە سـاڵی ٢٠٠٧دا، بـۆ جارێکـی تـر کۆلێـرا لـە عێراقـدا بڵاوبـووەوە، ئەمجـارە شـارەکانی هەرێمـی کوردسـتانیشـی گرتـەوە، بـە تایبەتـی پارێزگای سلێمانی. لـە نێـوان ڕۆژانـی ٢٠٠٧/٨/٢٣ و ٢٠٠٧/٩/٦دا، ژمـارەی ئەوانـەی کـە تووشـی سـکچوون و ڕشـانەوە بـوون لـە پارێـزگای سـلێمانی گەیشـتە ٣١٨٢ کـەس (WHO,a2007) لەوانـە ٩ کـەس گیانیـان لـە دەسـتدا. لـە کـۆی ئەوانـەی کـە تووشـی سـکچوون و ڕشـانەوە بووبـوون، کۆلێـرا لـە ٢٨٣ کەسـیان دۆزرایـەوە. دوای چـوار ڕۆژی تـر، واتـە لـە ٢٠٠٧/٩/١٠دا، ژمـارەی ئەوانـەی لـە پارێـزگای سلێمانی کـە تووشـی سـکچوون و ڕشـانەوە بووبـوون گەیشـتە ٦١٤٢ کـەس. ژمـارەی ئەوانـەی کـە بـێ دوودڵـی تووشـی کۆلێـرا بووبـوون گەیشـتە ٣٩٢ کـەس (WHO,b2007).

هەروەهـا لـە نێـوان ڕۆژانـی ٢٠٠٧/٧/٢٩ و ٢٠٠٧/٩/٢دا، لـە کەرکـوک ژمـارەی ئـەو کەسـانەی کـە تووشـی سـکچوون و ڕشـانەوە بووبـوون

گەیشتە ٣٧٢٨ کەس (WHO,a2007) یەک کەس لەوانەی کە تووشی سکچوون و ڕشانەوە بوون گیانی لە دەستدا و یەکەم نەخۆشی کۆلێرا لە ١٤/٨/٢٠٠٧دا لە کەرکوک دەستنیشانکرا. هەروەها لە هەمان ماوەدا، ٦ کەسی تر لە شاری هەولێر نەخۆشیەکەیان تیا دەستنیشانکرا. دوای ١٠ ڕۆژی تر واتە لە ١٢/٩/٢٠٠٧دا، ژمارەی ئەوانەی کە تووشی سکچوون و ڕشانەوە بوون لە کەرکوک گەیشتە ٦٧٤٩ کەس. لەو ماوەیەدا، نەخۆشییەکە بە توندی پارێزگای هەولێری گرتەوە و لە نێوان ١/٩/٢٠٠٧ و ١٠/٩/٢٠٠٧دا، کۆی ١١٦٤١ کەس لە هەولێر تووشی سکچوون و ڕشانەوە بوون (WHO,b2007) لە نێوان ئەوانەدا، کۆلێرا تەنها لە ٣٣ کەسیان دەستنیشانکرا.

لە کۆتایی مانگی ٩ی ٢٠٠٧دا، کۆلێرا بە هەموو عێراقدا بڵاوبووەوە (نەخشەی ژمارە ٢). نەخۆشیەکە ٢٥ شار و شارۆچکەی کوردستانی گرتەوە و هەروەها بە ٤ شاری خوارو و ناوەڕاستی عێراقیشدا بڵاوبۆوە. تا ٢٥/٩/٢٠٠٧، زیاتر لە ٣٠٠٠٠ کەس تووشی سکچوون و ڕشانەوە بوون و کۆلێرایش لە ٢١١٦ کەس دۆزرایەوە (WHO,c2007) تا مانگی ١٢ی ساڵی ٢٠٠٧، ژمارەی ئەوانەی کە تووشبوون بە نەخۆشییەکە گەیشتە ٤٤٦٧ کەس و ژمارەی مردووەکانیش ٢٤کەسی تێپەڕاند (WHO ,2010) تا کۆتای هاتنی پەتاکە، ٤٣ قەزا لە ١١ پارێزگای عێراقی گرتەوە. نەخشەی ژمارە (٢) ئەو شوێنانە پیشاندەدات کە کۆلیرای تێیدا بڵاوبووە لە عیراقدا. ژمارەیەکی کەمتری کۆلێرا لە ناوچە و پارێزگاکانی تری عێراق دەستنیشانکرا. بۆ نموونە لە تکریت ٦ و لە موسڵ ٢ و لە بەسرە ١ و لە بەغدا ٢ و لە دهۆکیش ١ کەس تووشی کۆلێرا بوون (WHO,c2007).







نەخشەی ژمارە ٢

کۆلێرا لە عیراقدا: ئەو حاڵەتانەی کە لەڕێی تاقیگەوە دەستنیشانکراون

(لە نێوان ٢٠٠٧/٩/٢٤-٨/١٤)

سەرچاوە: ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی WHO

پەتاکەی ساڵی ٢٠٠٧، ئەوەندە توند بوو کە حکومەتی هەرێمی کوردستان داوای یارمەتی لە یەکێتی ئەوروپا کرد بۆ ئەوەی فریای بکەوێت و دەستی یارمەتی بۆ کۆنترۆڵکردنی پەتاکە بۆ کوردستان درێژبکات (Parliament,2007) لە پرسیارێکیدا کە (پاولۆ کاساکا) ئاراستەی کۆمیسیۆنی ئەوروپای کرد لە بروکسلی پایتەختی بەلجیکا (بارەگای پەرلەمانی ئەوروپا)، لە میانی پرسیاری ژمارە ٧٤ی دانیشتنی ڕۆژی پێنجشەممە بەرواری ٢٠٠٧/٩/٢٧دا، کە ئاخۆ کۆمسیۆنی ئەوروپا چۆن وەڵامی داواکاری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەداتەوە بۆ ئەوەی یەکێتی ئەوروپا فریایبکەوێت و یارمەتی

بدات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کۆلێرا. لە وەڵامدا، کۆمسیۆنی ئەورووپا دەڵێت: کە لە نزیکەوە چاودێری بڵاوبوونەوەی کۆلێرا دەکات لە کوردستان. بەڵام کۆمسیۆنەکە ئاماژە بەوە دەکات کە وەکو ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئاماژەی پێداوە، لیژنەیەکی باڵا، کە لە لایەن وەزیری تەندروستییەوە سەرپەرشتی دەکرێت، دامەزراوە و هەنگاوە پێویستەکان نراون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پەتاکە. هەروەها کۆمسیۆنی ئەورووپا ئاماژە بەوە دەکات کە ڕێژەی مردن بە هۆی پەتاکە نزیکەی ١٪ە، کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی پەتاکە لە ژێر کۆنترۆڵدایە. هەورەها لە وەڵامەکەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کەوا ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی و کۆمیتەی مانگی سووری نێودەوڵەتی و بەڕێوەبەرایەتی گشتی هاوکاریی مرۆیی سەر بە یەکێتی ئەورووپا یارمەتی پێویستیان لەڕووی بودجەوە پێشکەشی حکومەتی هەرێمی کوردستان کردووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پەتاکە. هەورەها لە هەمان وەلامدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە یەکیتی ئەورووپا لە ساڵی ٢٠٠٤وە بە بەردەوامی یارمەتی سێکتەری تەندروستیی لە عێراقدا داوە. وەڵامەکە بڕی ١٢ ملیۆن یۆرو وەکو نموونە دەهێنێتەوە لە کۆی ئەو بودجەیەی بۆ کەرتی تەندروستیی عێراق خەرجکراوە بە هەرێمی کوردستانیشەوە. بە پێودانگی کۆی ئەو زانیاریانەی لە وەڵامەکەدا هاتووە، دەرکەوتووە کە یەکێتی ئەورووپا ئەرکەکانی خۆی جێبەجێکردووە و پێویست بە یارمەتی تر ناکات.

لە ساڵی ٢٠٠٨دا، ٩٢٥ کەس تووشی کۆلێرا بوون لە عیراقدا (WHO 2010, ١١ کەس لەوانە بە نەخۆشییەکە مردن. پەتاکە لە نیوەی مانگی ٨ دا دەستی پێکرد و لە ناوەڕاستی مانگی ٩دا ژمارەی تووشبووان گەیشتە ٩٦ کەس. دوای مانگێک شەپۆلێکی تر لە خوارووی عێراق دەستیپێکرد و ژمارەی ئەوانەی کە تووشبوون بە تایبەتی لە پارێزگای دیوانیە گەیشتە ١٦١ کەس. لە ساڵی ٢٠٠٩، تەنها ٦ کەس تووشی کۆلێرا بوون.

# کورتەی بەشی سێیەم



•لە پەتاکە ساڵی ٢٠١٢، بۆ یەکەم جار نەخۆشی کۆلێرا لە سلێمانی لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١٥دا سەری هەڵدا.

•پەیوەندی و هەماهەنگی لە نێوان فەرمانگەی تەندروستیی سلێمانی و وەزارەتی تەندروستیی لە ئاستێکی خراپ دابوو لەمەڕ کۆلێرا.

•تاوەکو ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٨، کۆی ئەو کەسانەی بە هۆی سکچوون و ڕشانەوە داخڵی نەخۆشخانەی فریاکەوتن کران بریتی بوون لە ١٦٠٥ کەس و ژمارەی ئەوانەی کە کۆلێرایان هەبوو گەیشتە ١٩٢ کەس.

•ڕێژەی ئافرەتان لە کۆی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون ٥١٪یە بە

بەراورد بە ڕێژەی پیاوان کە ٤٨٪یە.

• زۆربەی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون سەر بە گروپی تەمەنی ١٥ -٢٩ن بە ڕێژەی ٣٨٪.

• گروپی تەمەنی ٣٠-٤٤ لە پەلەی دووەم دێت و بەڕێژەی ١٧٪.

• زۆربەی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون دانیشتووی پارێزگای سلێمانی بوون.

• زۆربەی ئەوانەی کە لە پارێزگای سلێمانی تووشی پەتاکە بوون دانیشتووی خودی قەزای سلێمانی خۆی بوون.

• گەڕەکەکانی ئازادی و بەکرەجۆ و قرگە بە پلەی یەکەم و دووەم و سێیەم دێن لە بڵاوبوونەوەی کۆلێرادا.

• زۆربەی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون، یا ئافرەتی ماڵەوەن یا قوتابین.

• کۆلێرا لە کۆتایی هاوین و سەرەتای پایزدا بڵاودەبێتەوە

• سەرچاوەی سەرەکی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە کوردستاندا، ئاوی ماڵانە.

## زانیاری گشتی لەسەر پەتاکە:

دەستنیشانکردنێکی وردی ڕۆژی سەرهەڵدانی نەخۆشی کۆلێرا لە پایزی ساڵی ٢٠١٢ لە پارێزگا و شاری سلێمانیدا کارێکی ئاسان نیە. لێدوانی جیاجیا و هەندێک جار دژ بە یەک لە لایەن بەرپرسانی وەزارەتی تەندروستییەوە بەدیدەکرێت دەربارەی ڕۆژی سەرهەڵدانی نەخۆشیەکە. ئەمە بۆخۆی بەڵگەیەکی گەورەیە لە سەر ئەوەی کە وەزارەتی تەندروستیی لە ئاستێکی ئەوتۆدا نیە کە بتوانێت لە سەرهەڵدانی نەخۆشییەکی ترسناکی وەکو کۆلێرادا ئاگایی بدات و هاوڵاتیان لە مەترسی بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە نەخۆشیە ئاگادارکاتەوە.

لـە لێدوانێکـی رۆژنامەوانیـدا، وەزیـری تەندروسـتیی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان ئامـاژەی بـۆ ئـەوە کـرد کـە بـۆ یەکـەم جـار نەخۆشـی کۆلێـرا لـە سـلێمانی لـە رۆژی ٢٠١٢/٩/١٥دا سـەری هەڵـدا (Awene ,a2012). بەپێـی هەمـان لێـدوان، وەزیـری تەندروسـتیی ئامـاژەی بـۆ ئـەوە کـرد کـە بەپێـی پشـکنینەکانی فەرمانگـەی تەندروسـتیی سـلێمانی، نەخۆشـییەکە لـە ٢٧ حاڵەتـدا دەرکەوتـووە کـە لـەو رۆژەدا پشـکنینیان بـۆ کرابـوو.

لـە رۆژی ٢٠١٢/٩/٢٨، فەرمانگـەی تەندروسـتیی سـلێمانی لەسـەر زاری بەڕێوەبـەری فەرمانگەکـە ڕایگەیانـد کـە ژمـارەی ئەوانـەی تووشـی سـکچوون و ڕشـانەوە بـوون دوو ئەوەنـدە زیـادی کـردووە بـە بـێ ئـەوەی ژمـارە ڕاستەقینەکان بخاتـە ڕوو. هەروەهـا لـە هەمـان لێدوانـدا، فەرمانگـەی تەندروسـتیی ڕایگەیانـد کـە مەترسـی ئەوەیـان هەیـە کـە نەخۆشـی کۆلێـرا تووشـی ٦ کـەس بووبێـت لەوانـەی کـە بـۆ سـکچوون و ڕشـانەوە داخڵـی نەخۆشـخانە کـراون (Sbeiy,2012).

سـەرباری ئـەم وتـە و لێدوانانـەی بەڕێوەبـەری فەرمانگـەی تەندروسـتیی سـلێمانی، لێدوانەکانـی وەزیـری تەندروسـتیی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان، ئـەوە دەردەخـات کـە پەیوەنـدی و هەماهەنگـی لـە نێـوان فەرمانگـەی تەندروسـتیی سـلێمانی و وەزارەتـی تەندروسـتیی لـە ئاسـتێکی خـراپ دایـە. بـۆ نموونـە وەزیـری تەندروسـتیی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان رۆژێـک دوای ئـەو لێدوانـەی بەڕێوەبـەری فەرمانگـەی تەندروسـتیی دەڵێـت: «ئێمـە گومانـی ئەوەمـان هەیـە، هەندێـک لـەو نەخۆشـانە تووشـی کولێـرا بووبـن. سـەرەڕای ئـەوەی تاقیگەکانـی ناوەنـدی خۆمـان ئـەوەی سـەلماندوە، بـەڵام دەبێـت بنێرێـت بـۆ شـاری بەغـدا و لەوێـش لەوەزارەتـی تەندروسـتیی عێراقـی فیـدراڵ جێگیـر بکرێـت» (Peyamner 2012). ئـەم لێدوانـە دژیـەک و تەمومژاویانـەی بەرپرسـەکانی تەندروسـتیی، دڵەڕاوکێـی هاوڵاتیانـی زۆرترکـرد

و بێمتمانەیی دروستکرد لە توانای دەزگا تەندروستییەکان بۆ یەکەم دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە و دووەمەیش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی.

لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٣٠ و لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا، وەزیری تەندروستیی حکومەتی هەریمی کوردستان، ڕایگەیاند کە ژمارەی ئەوانەی تووشی کۆلێرا بوون گەیشتووەتە ١٩ کەس (Kurdiu2012) هەرچەندە ئەم لێدوانانەی بەرپرسان، دڵنیایەکی لای هاوڵاتیان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ڕێکخروەکان دروستکرد لەسەر ئەوەی کە نەخۆشی کۆلێرا، بڵاوبووەتەوە، بەڵام کۆمەڵێک لێدوانی تری هەمان ئەو بەرپرسانە، بوارێکی بۆ دوودڵی هێشتەوە. بۆ نموونە وەزیری تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا کە لەگەڵ هەر یەکە لە وەزیری شارەوانی و پارێزگاری سلێمانی بەستی، باسی لە «ئەگەری بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرا لە سلێمانی و چۆنیەتی ڕێگری لە تەشەنەسەندنی نەخۆشییەکە» کرد (Awene,2012a)

تاوەکو ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٣، بە پێی ئامارە فەرمییەکانی فەرمانگەی تەندروستیی سلیمانی نزیکەی ٥٠٠ نەخۆش بە هۆی سکچوون و ڕشانەوە لە نەخۆشخانە خەوێنرابوون. لە کۆی ئەوانەی کە پشکنینیان بۆ کرابوو، لە ٥٣ کەسیاندا، نەخۆشی کۆلێرا دۆزرابووەوە (Kurd- ,2012 istanNwe) دۆخی تووشبون بە پەتاکە ئەوەندە توند بوو، هەر لە ٢٠١٢/١٠/٣دا،بەتەنها لە ماوەی ٢٤ کاژێردا، ٢٠٥ کەس بە هۆی سکچوون و ڕشانەوە داخڵی نەخۆشخانەی فریاکەوتن کرابوون (Sbeiy ,2012).

بەپێ لێدوانە فەرمییەکانی فەرمانگەی تەندروستیی سلێمانی، ژمارەی ئەوانەی کە بۆ سکچوون و ڕشانەوە سەردانی نەخۆشخانەکانی فریاکەوتنی شارەکەیان دەکرد لە ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٦وە بەرەو کەمبوونەوە ڕۆیشت و لە ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٨، بەگوێرەی هەمان سەرچاوە، ٧٠ کەس سەردانی

نەخۆشــخانەکانیان کردبــوو (Kurdsat2012a) تاوەکــو ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٨، کـۆی ئـەو کەسـانەی بـە هـۆی سـکچوون و ڕشـانەوە داخڵـی نەخۆشـخانەی فریاکەوتــن کــران بریتــی بــوون لــە ١٦٠٥ کــەس و ژمــارەی ئەوانــەی کــە کۆلێرایــان هەبــوو گەیشــتە ١٩٢ کــەس (Kurdsat2012a)

لــە ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/١٨دا، وەزیــری تەندروســتیی حکومەتــی هەرێمــی کوردســتان ئــەوەی ڕاگەیانــد کــە نەخۆشــی کۆلێــرا لــە کوردســتان نەمــاوە و نەخۆشــیەکە کۆنترۆڵکــراوە (Golan 2012).

## ژمارەی نەخۆشی مێ بۆ نێر:

زانینــی ژمــارەی ئەوانــەی کــە تووشــبوون و دابەشــبوونیان بــە پێــی جەنــدەر، کۆمەڵێــک زانیــاری گرنگمــان پێدەبەخشــێت لەســەر شــێوازەکانی گواســتنەوەی نەخۆشــییەکە و هەروەهــا ئامادەباشــی جەندەرێــک بــە بــەراورد بــەوی تریــان بــۆ تووشــبوون بــە کۆلێــرا **(گرافــی ژمــارە ٢)**




گرافی ژمارە ٢

ڕێژەی تووشبوون بە کۆلێرامان پێشاندەدات بە پێی جەندەر.

وەکـو لـە گرافەکـەدا دیـارە ڕێـژەی ئافرەتـان لـە کـۆی ئەوانـەی کـە تووشـی کۆلێـرا بـوون ٥١٪ە بـە بـەراورد بـە ڕێـژەی پیـاوان کـە ٤٨٪. هەرچەنـدە ڕێـژەکان زۆر لـە یەکـەوە دوور نیـن، بـەڵام دەکرێـت کۆمەڵێـک دەرئەنجـام لـەم ژمارانـەوە دەسـتبکەوێت. سـەرەتا دەبێـت ئـەوە بووترێـت کـە توێژینـەوەکان لەسـەر ئاسـتی جیهانـدا ئەوەیـان پیشـانداوە کـە کاتێـک کۆلێرا بـۆ یەکەمیـن جـار لـە شـوێنێکدا بڵاودەبێتـەوە ئـەوا ڕێـژەی تووشـبووان لـە نـاو پیاوانـدا زۆرتـرە لـە ژنـان. شـارەزیان ئـەوە ڕیـژە زۆرەی تووشـبووان لـە ڕەگـەزی پیـاو بـۆ ئـەوە دەگەڕێننـەوە کـە پیـاو لـە ژن جموجوڵـی زیاتـرە و زۆرتـر دەچێتـە دەرەوە بۆیـە ئەگـەری تووشـبوونی بـە نەخۆشـییەکە زیاتـرە (WHO ,1970) بـەڵام لـەو شـوێنانەی کـە کۆلێـرا تێیـدا دامـەزراوە و بـووە بـە نەخۆشـییەکی درێژخایـەن، ئـەوا ڕێـژەی ئەوانـەی تووشـی پەتاکـە دەبـن لـە نـاو ژنانـدا زیاتـرە وەک لـە پیـاوان. لـە ڕاسـتیدا ئـەو دۆزینـەوەی کـە ژمـارەی ئافرەتـی تووشـبوو زیاتـرە لـە ژمـارەی پیـاوان لـە کوردسـتاندا، بۆمـان دەردەخـان کـە کۆلێـرا ڕەگەکانـی لـە کۆمەڵـگای کوردسـتاندا داکوتاوە و بـووە بـە نەخۆشـیەکی درێژخایـەن.

سـەرەتا ئـەو دابەشـبوونەی سـەرەوە شـتگەلێکی زۆرمـان پـێ دەڵێـت لەسـەر شـێوازی گواسـتنەوەی نەخۆشـیەکە و ئامادەباشـی گروپێـک یـا جەندەرێـک بـە بـەراورد بـەوی تریـان بـۆ نەخۆشـکەوتن بـە کۆلێـرا (Durana ,1994) وەک زانـراوە، کۆلێـرا لـە ڕێـی ئـاو و خواردنـی پیسـەوە دەگوازرێتـەوە. لـە کۆمەڵگایەکـی سـونەتیی وەکـو کوردسـتانیش، ئافـرەت زۆرتریـن کاری ماڵـەوەی بەردەکەوێـت. زۆربـەی ئـەو کارانـەی لـە ماڵـەوەش دەکرێـن، پەیوەندییـان بـە ئـاوەوە هەیـە. بـۆ نموونـە شـتنی قاچـاغ و کـەل و پـەل و خاوێنکردنـەوەی ماڵـەوە و ئاودانـی باخچـە و شـتنی منـداڵ... هتـد هەموویـان بـە ئـاو دەکرێـن و زۆربـەی جـارەکان ئەگـەر هەموویـان نەبێـت لـە لایـەن ئافرەتـەوە ئەنجامدەدرێـن. بۆیـە جێـگای سەرسـامی نیـە

کە زۆربەی ئەوانەی تووشی کۆلێرا دەبن، ئەگەر هاتوو ئاوی خواردنەوە پیس ببێت، لە ئافرەتانن. هەروەها بە هەمان شێوە، ئەگەر هاتوو خواردن بە بەکتیریای کۆلێرا پیسبووبێت، بە تایبەتی سەوزە، ئەوا یەکەمین کەسێک لە خێزان کە ڕەنگە تووشی بەکتیریاکە ببێت ئافرەتە.

هاوکات، یەکێک لەو هۆکارانەی کە ناسراوە بۆ بڵاوبوونەوەی کۆلێرا نەبوونی مەرجەکانی تەندروستیی و پاک و خاوێنیە لە ماڵەکاندا (KITTS, Robrts, and Canada, 1996) ئەوەی ئاشکراشە لە کۆمەڵگایەکی وەکو کوردستاندا، ئافرەت زۆربەی کاتەکەی لە ماڵەوە بەسەردەبات و کەمتر لە پیاو دەردەچێتە دەرەوە. بۆیە زۆربەی ئەو مەترسیانەی کە لە دەرەئەنجامی نەبوونی مەرجەکانی پاک و خاوێنی لە ناو ماڵدا یا نەبوونی مەرجەکانی تەندروستیی لە فرێدانی پاشماوەکانی ئەندامەکانی تری خێزان، ڕووبەڕووی ئافرەتی ماڵەوە دەبێتەوە. لە پاڵ ئەمانەشدا، بە هۆی نەچوونە دەرەوە، ئافرەتی ماڵەوە کەمتر لە ئەندامەکانی تری خێزان بەو ڕێنمایەنە ئاشنا دەبێت کە بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی و پابەندبوون بە مەرجەکانی تەندروستییەوە بڵاودەبێتەوە.

سەربارەی ئەوەی کە ئافرەت لە خێزاندا یەکەمین کەسێکە کە ڕەنگە تووشی کۆلێرا ببێت و یەکەمین کەسێکە کە ڕووبەڕووی بەکتریایەکە دەبێتەوە، بە هەمان شێوەش ئافرەت یەکەمین کەسە کە لە لەکاتی نەخۆشکەوتنی ئەندامێکی خێزاندا ئەرکی خاوێنکردنەوە و خزمەتکردنی ئەو ئەندام خێزانەی بەردەکەوێت کە تووشی نەخۆشیی دەبێت. ئەمە بۆ خۆی هۆکارێکی ترە کە ڕێژەی ئافرەتان لەوانەی کە تووشی نەخۆشیی کۆلێرا دەبن زیاتر بێت بە بەراورد بە پیاوان.

کۆی ئەم فاکتەرانە پێمان دەڵێن کە لە کاتی پلانداناو ئەنجامدانی کەمپینی هۆشیارکردنەوە یاخود هەر پرۆژە و بەرنامەیەکی تر بۆ

ڕووبەڕووبوونـەوەی کۆلێـرا، پێویسـتە ئافرەتـان بـە گشـتی و ئافرەتـی ماڵـەوە بـە تایبەتـی یەکەمیـن گروپێـک بـن کـە ئـەو کەمپیـن و پرۆژانـە بیانگرێتـەوە. ئـەو کەمپینانـە دەکرێـت کۆمەڵێـک پـرۆژەی وەکـو هۆشـیاری و فێرکردنـی مەرجەکانـی تەندروسـتیی... هتـد بگرێتـەوە.

بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، نابێـت ئـەو ڕاسـتیە لـە یادبکرێـت کـە هۆکارەکانی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـەوە گەورەترن کـە تەنها بە هۆشـیارکردنەوەی ئافرەتی ماڵــەوە بــە مەرجەکانــی تەندروســتیی و پاکوخاوێنــی چارەســەربکرێن. لــە ڕاسـتیدا ئـەو هۆکارانـە پەیوەندییـان بـە کۆمەڵێـک پێـدراوی کۆمەڵایەتـی و ئابـوری و سیاسـی گەورەتـر هەیـە و بـە تەنهـا کار کـردن لـە سـەر ئافرەتـی ماڵـەوە ڕەنگـە زەرەری لـە قازانجـی زیاتـر بێـت.

بـۆ نموونـە یەکێـک لـەو ئەرگومێنتانـەی لـە لایـەن حکومەتـە گەنـدەڵ و نا بەرپرسـەکان پێشـنیاردەکرێت بـۆ بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا ئەوەیـە کـە خەڵکەکە خـۆی ناهۆشـیارە و کەسـەکان خۆیـان تەندروسـتیی و پاکوخاوێنـی خۆیـان پشـتگوێدەخەن. ئـەم ئەرگومێنتـە تـا ڕادەیـەک سـەرکەوتوو بـووە لـەوەی کـە ئـەو جـۆرە حکومـەت و دەسـەڵاتانە (بـەوەی لای خۆشـمانەوە) بتوانـن خۆیـان لـە بەرپرسـیارێتی دەربـاز بکـەن و ئەرکـەی خۆیـان لـە دابینکردنـی ئـاوی پاکـی خواردنـەوە و بنەمـا سـەرەتایەکانی تەندروسـتیی بـۆ هاوڵاتیـان جێبەجێبکـەن. بۆیـە نابێـت کەسـێک تەماشـای ئـەو داتایانـەی سـەرەوە بـکات و یەکسـەر ئـەو ئەنجامگیریـە بـکات کـە تەنهـا بـە هۆشـیارکردنەوەی ئافرەتــی ماڵــەوە ئیتــر تــەواوی کێشــەکانی پەیوەســت بــە تەندروســتیی و پاکوخاوێنیــەوە چارەســەر دەبــن. بــۆ نموونــە ئەگــەر ئافرەتــی ماڵــەوەش پابەنـدی ڕێنماییـە سـەرەتایەکانی پـاک و خاوێنـی ببێـت، بـەڵام لـە هەمـان کاتــدا ئــاوی خواردنــەوەی ماڵەکــە پیــس بێــت و بەکەڵکــی بەکارهێنــان و خواردنـەوە نەیـەت، پابەندبوونـی ئافرەتەکـە هیـچ گۆڕانکاریـەک لـە ئەگـەری

تووشبوون بە کۆلێرا یا هەر نەخۆشییەکی گواستراوەی تر ناکات.

هاوکات، هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و دەستنیانشکردنی ئافرەتیماڵەوە وەکو ئەو کەسەی کە دەبێت زۆرترین چالاکییە تەندروستییەکان ئاراستەیان بکرێت، دەشێت کێشەی گەورەتر دروستبکات وەکو لەوەی کێشەکان چارەسەربکات. وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا، زۆربەی ئەرکەکانی ماڵەوە لە لایەن ئافرەتەوە جێبەجێدەکرێت. زۆربەی ئەو ڕێنماییانەی کە بۆ کەمکردنەوەی گواستنەوەی کۆلێرا بڵاودەکرێنەوە پەیوەندییان بە زیادکردنی ئەرکی ماڵەوە هەیە. بۆ نموونە یەکێک لەو ڕێنماییە سەرەکییانە کوڵاندنی ئاوی خواردنەوەیە. ڕەنگە ئەم داواکارییە بۆ بەرپرسێکی تەندروستیی کە لە ئۆفیسەکەی خۆی دانیشتووە و لە ئاوی بوتڵ دەخواتەوە زۆر داواکارییەکی سادە بێت. بەڵام بۆ ئافرەتێکی ماڵەوە کە دەبێت نان بکات و خواردن ئامادەبکات و قاپ بشوات و منداڵ خاوێنبکاتەوە و ئامادەیان بکات بۆ قوتابخانە ....هتد سەرئێشە و ئەرکێکی زیاتر بێت. ئەمە ئەگەر ئەو تێچوون و خەرجی و زیادە مەسرەفە لە یادبکەین کە لە ئەنجامی کوڵاندنی ئاو دروستدەبێت کە دەشێت لە توانای دارایی زۆرێک لەو خانەوادە هەژارانە بەدەر بێت کە تووشی کۆلێرا دەبن.

## دابەشبوونی تەمەن:

ئەو ژمارانەی کە لە بەردەستان، زانیاریەکی گرنگمان پێ دەبەخشن لە سەر دابەشبوونی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون بە پێی تەمەن. گرافی ژمارە ٣ ڕێژەی ئەو کەسانە دەخاتە ڕوو کە تووشی کۆلێرا بوون و سەر بە گروپە تەمەنیەکانی ٠-١٤، ١٥-٢٩، ٣٠-٤٤، ٤٥-٦٤، و لە سەرروو ٦٥ـەوەن.




گرافی ژمارە ٣

دابەشبوونی حاڵەتەکانی کۆلێرا بە گوێرەی تەمەن

وەکو لە گرافەکەی سەرەوە دەردەکەوێت زۆربەی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون سەر بە گروپی تەمەنی ١٥-٢٩ن بە ڕێژەی ٣٨٪. دوای ئەوە، گروپی تەمەنی ٣٠-٤٤ لە پەلەی دووەم و بەڕێژەی ١٧٪ دێت. لەم ژمارە و ڕێژانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەی ئەوانەی تووشی کۆلێرا بوون لە توێژی گەنجانن. دیارە ئەمە بۆ خۆی شتێکی ئەوتۆمان پێ ناڵێت جگە لەوەی کە گەنجەکان لەو گروپە تەمەنەن کە زۆرترین چالاکییان هەیە و زیاتر لە هەموو گروپێکی تر دەچنە دەرەوە و ڕەنگە ڕووبەڕووی ئاوی پیس و خواردنی پیس ببنەوە. ئەمە نەک تەنها بۆ گەنج لە ڕەگەزی نێر ڕاستە، بەڵکو حاڵی حازر بۆ ئافرەتیش ڕاستە بە تایبەتی ئەگەر ئەوە بهێنینەوە یادی خۆمان کە ئەوە ئافرەتی گەنجە کە زۆرترین کاری ماڵەوە دەکات و ئەگەری ئەوەی هەیە کە زۆرتر لە

تەمەنەکانی تر ڕووبەڕووی مەترسی ئاو و خواردنی پیس ببێتەوە.

دابەشبوونی کۆلێرا لە نێو ئەو گروپانەی تەمەن جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ ڕوودانی کۆلێرا لە شوێنەکانی تر و بە تایبەتی وڵاتەکانی دەروبەر نیە. واتە لەو وڵات و شوێنانەش بە هەمان شێوەی کوردستان، کۆلێرا لەو گروپانەی تەمەن زیاترە کە سەر بە توێژی گەنجانن (Swartz 1972,) .بەڵام جیاوازیەکی گرنگ هەیە لە نێوان کوردستان و وڵاتەکانی تردا. لە کاتێکدا لەو وڵاتانەی کە کۆلێرا تێیدا ڕەگی دانەکوتاوە و بۆ یەکەمین جار بڵاودەبێتەوە، زۆرتر لە نێوان گەنجاندا بڵاودەبێتەوە، لەو وڵاتانەشی کە کۆلێرا دامەزراوە و نەخۆشیەکی درێژخایەنە، زیاتر لە نێوان منداڵاندا بڵاودەبێتەوە. هۆکاری ئەم دابەشبوونەش ئەوەیە کە لەو ولاتانەی کە کۆلێرا نەخۆشیەکی درێژخایەنە، کەسە باڵغەکان و گەنجەکان بەرگەری پەیدا دەکەن بۆ نەخۆشیەکە و کەمتر لە منداڵان تووشی پەتاکە دەبەن بە پێچەوانەی منداڵەکانەوە کە هیچ بەرگرییەکیان نیە. بەڵام لەو وڵاتانەی کە تازە تووشی کۆلێرا دەبن و نەخۆشیەکە پەتایەکی تازەیە ئەوا گەنجەکان و کەسە باڵغەکان بەرگەرییەکی ئەوتۆیان نیە بۆیە زۆربەی ئەوانەی تووش دەبن لەو گروپەی تەمەنن (WHO ,1970).

## شوێنی دانیشتن:

وەکو لە گرافی ژمارە ٤ دەردەکەوێت، زۆربەی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون لەو پەتایەی کە لە ساڵی ٢٠١٢دا کوردستانی گرتەوە، دانیشتووی پارێزگای سلێمانی بوون. زۆربەی ئەوانەشی کە لە پارێزگای سلێمانی تووشی پەتاکە بوون دانیشتووی خودی قەزای سلێمانی خۆی بوون. ئەم دۆزینەوانە کۆمەڵێک زانیاری گرنگمان پێدەبخشن و دەبێت هاندەرێک بن بۆ گەڕانێکی فراوان و بەردەوام بە دوای ئەو هۆکارانەی

کە لە پشت ئەو ڕاستیەوەن کە پەتای کۆلێرا بە زۆری لە پارێزگا و شاری سلێمانیدا بڵاوبووەتەوە.

ناوەندی قەزای سلێمانی بە بەراورد بە قەزا و ناحیەکانی تری سەربە پارێزگای سلێمانی و تەنانەت سەر بە قەزای کەرکووکیش زۆرترین ڕێژەی نەخۆشکەوتن بە کۆلێرای بەرکەوتووە. ئەم زانیاریانە ئەگەر هیچمان پێ نەڵێن ئەوا ئەوەمان پێدەڵێن کە دەبێت هۆکارێک هەبێت لە ناو شاری سلێمانی کە لە پشت بڵاوبوونەوەی پەتای کۆلێراوەیە. بۆ ئەوەی بە دوای ئەو هۆکارە بگەڕێین و بیدۆزینەوە دەبێت زانیاری زیاتر کۆبکەینەوە.




گرافی ژمارە ٤

دابەشبوونی حاڵەتەکانی کۆلێرا بەگوێرەی قەزاکان

ئـەوەی گرنگـی ئـەم وێنەیـەی سـەرەوە و ئـەو زانیاریانـەی کـە پێمـان دەبەخشـێت زیـادەکات ئەوەیـە کـە گرافەکـە جیاوازێکـی گـەورەی هەیـە لەگـەڵ کۆمەڵێـک داتـا و ژمـارە و زانیـاری پێشـتر کـە لەسـەر کۆلێـرا چـی لـە عێـراق و ناوچەکـە بـە گشـتی زانـراوە. ئـەوەی لەبـارەی کۆلێـراوە زانـراوە ئەوەیـە کـە ئـەم نەخۆشیە لـە ناوچـە و شـوێن دووردەستەکاندا بـە تایبەتـی لـە لادێ و شـارو شـارۆچکەکاندا بڵاودەبێتـەوە نـەک لـە ناوەنـدی شـارە گـەورەکان و سـەنتەری ئـەو شـارانە (Khwaif, al et ,2012) بۆیـە بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا بـە چـڕی لـە قـەزای ناوەنـدی سـلێمانی زۆر شـتمان پێدەڵێـت لەسـەر ئەگـەری زۆری پیسـبوونی ئـاوی خواردنـەوەی شـاری سـلێمانی.

یەکێـک لـەو زانیاریانـەی کـە گرنگیەکـی گـەورەی هەیـە لـە یارمەتیدانمان بـۆ دۆزینـەوەی هۆکارەکانـی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا و چـڕی ژمـارەی ئەوانـەی کـە تووشـبوون لـە پارێـزگا و شـاری سـلێمانیدا، بریتیـە لـە دابەشـبوونی ژمـارەی نەخۆشـەکانە بەسـەر گەڕەکـە جیاجیاکانـی شـاری سـلێمانیدا. **گرافـی ژمـارە ٥** ئـەو دابەشـبوونەمان پیشـاندەدا.




گرافی ژمارە ٥

دابەشبوونی حاڵەتەکانی کۆلێرا بەگوێرەی گەڕەکەکانی شاری سلێمانی

وەکو لە وێنەکەدا بە ڕوونی دەردەکەوێت، هەریەکە لە گەڕەکەکانی ئازادی و بەکرەجۆ و قرگە بە پلەی یەکەم و دووەم و سێیەم دێین لە بڵاوبوونەوەی کۆلێرادا.

واتە ئەو سێ گەڕەکە زۆرترین ژمارەی تووشبووانیان بەردەکەوێت. بۆیە یەکەمین پرسیار ئەوەیە کە ئایە دەبێت چی فاکتەرێک یا کۆمەڵە فاکتەرێک هەبێت لە پشت بڵاوبوونەوەی پەتاکە لەم سێ گەڕەکە بە دیاریکراوی بە ڕێژەیەکی زۆر. بە مانایەکی تر، ئاخۆ دەبێت چی شتێک یا

چی کۆمەڵە شتێک هەبێت کە هاوبەش بێت لە نێوان ئەم سێ گەڕەکە. ئەو پرسیارە بۆ گەڕەکەکانی تریش ڕاستە کە ژمارەیەکی زۆری نەخۆشی کۆلێرایان تێیدا سەریهەڵەدا و دۆزرایەوە. لە بەشەکانی خوارەوە قسە لەسەر سەرچاوەکانی ئاو دەکەین و هەوڵدەدین باسێکی سەرچاوەکانی ئاوی شاری سلێمانی بکەین کە بتوانێت تیشک بخاتە سەر ئەو فاکتەر و هۆکارانەی کە دەشێت ڕۆڵیان هەبووبێت لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە لەو گەڕەکانەدا.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری شێوازی دابەشبوونی ئەوانەی کە تووشی نەخۆشییەکە بوون لە شاری سلێمانی و دابەشبوونیان بە سەر گەڕەکە جیاجیاکاندا (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٣).




نەخشەی ژمارە ٣

دابەشبوونی حاڵەتەکانی کۆلێرا لە گەڕەکەکانی شاری سلێمانیدا.

ئەو نەخشەیەی سەرەوە، نەخشەیەکی شاری سلێمانی و دابەشبوونی ژمارەیەک لەو نەخۆشانە دەردەخات بە سەر گەڕەک و ناوچە جیاجیاکانی شاری سلێمانیدا. دیارە ئەم نەخشەیە جیاوازییەکەی ئەوتۆی لە گەڵ گرافەکەی سەرەوەدا نیە کە ژمارەی نەخۆشەکان بە پێی گەڕەکەکانی شاری سلێمانی دەستنیشانکرد. بەڵام ئەم نەخشەیە یارمەی ئەوەمان دەدات بۆ ئەوەی بزانین لە چی ناوچەیەکی شاری سلێمانی کۆلێرا بە زۆری بڵاوبووەتەوە.

ئەمە یارمەتیمان دەدات بۆ چڕکردنەوەی گەڕان بەدوای هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لەو گەڕەکانە و دواتر بەرپاکردنی کەمپین و بەرنامە و پرۆژەی خۆپاراستن و کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکە لەو گەڕەک و ناوچانەی کە زۆرترین نەخۆشیان تیا دەرکەوتووە.

ئەوەی لە نەخشەکە و شوێنی دانیشتنی ئەو هاوڵاتیانەی کە تووشی نەخۆشییەکە بوون دەردەکەوێت ئەوەیە کە بە زۆری ئەو هاوڵاتیانەی تووشبوون دانیشتووی گەڕەکانی بازنەکانی دەوروبەری شاری سلێمانین. بەبەراورد بە سەنتەری شارەکە و ئەو گەڕەکانەی کە لە ناو شاردان، گەڕەکەکانی دەوروبەر زۆرتر تووشی کۆلێرا بوون.

ئەم دۆزینەوەیە ڕەنگە سوودی هەبێت بۆ ئەوەی بزانین سەرچاوەکانی ئاوی ئەو گەڕەکانی کە تووشبوون لە کوێیەوە دێت و ئایا بۆچی ئەو گەڕەکانە بە دیاریکراوی زۆرترین ژمارەی نەخۆشیان بەرکەوتووە.

دیارە زانینی ئەو زانیاریانە پێویستی بە توێژینەوەی زیاتر و پێویستی بە هەماهەنگی کۆمەڵێک لایەنی پەیوەندیداری وەکو بەڕێوەبەرایەتیەکانی ئاو و ئاوەڕۆی پێویستە بۆ ئەوەی بزانین سەرچاوەی ئاوی ئەو گەڕەکانە لە کوێیەوە دێت و ئایا سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوەی ئەو گەڕەکانە لە ئاستێکی باشدان یا کوالێتی ئاوی خواردنەوە و بارودۆخی بۆرییەکانی

ئـاو کـه بـۆ ئـەو گەڕەکانـە دەچێـت پیسـبوون یـا شـکاون. هـاوکات زۆر گرنگـە شـێوازی دەردان و فڕێدانـی ئـاوەڕۆ و پاشـماوەی پیسـایی ماڵەکانـی ئەو گەڕەکانـە بـە وردی لێکۆڵینـەوەی لەسـەر بکرێـت و دڵنیایـی بدرێـت بـە هاوڵاتیـان لەسـەر تێکەڵنەبوونـی سـەرچاوەکانی ئـاو بـە ئـاوەڕۆو و پیسـایی و پاشـماوەکانەوە.

هەروەهـا فاکتەرێکـی گرنگـی بڵاوبوونـەوەی کۆلیـرا بریتیـە لـە چـڕی دانیشـتوان و نزیکـی هاوڵاتیـان لـە یەکـەوە کـە ئەگەرەکانـی گواسـتنەوەی نەخۆشـییەکە زیاتـر دەکات (Dick et al ,2012).

ڕەنگـە ئـەو گـەڕەک و ناوچانـەی کـە زۆرتریـن ژمـارەی نەخۆشـییان بەرکەوتـووە لـە گەڕەکـە قەرەباڵـغ و چـڕەکان بـن. بـەڵام بـۆ سـەلماندنی ئـەو تێـورە، پێویسـت بـە کۆکردنـەوەی زانیـاری و داتـای زیاتـر دەکات لەسـەر ژمـارە و چـڕی دانیشـتوانی ئـەو گەڕەکانـە و سـەلماندنی ڕاسـتی یـا ناڕاسـتی ئـەو گریمانەیـەی سـەرەوە لەڕێـی ژمـارە و داتـاوە.

هـاوکات ئـەوەی لـە توێژینەوەکانـی تایبـەت بـە نەخۆشـی کۆلێـرا سـەلمێنراوە ئەوەیـە کـە نەخۆشـییەکە (وەکـو زۆربـەی درم و نەخۆشـییە گواسـتراوەکانی تـرەوە) لـە شـوێنە هەژارنشـینەکان و بـە گشـتی لـە نـاو هەژاراندا بڵاودەبێتـەوە (Dick et al 2012). هەرچەنـدە ژمـارە و داتایەکـی ئەوتـۆ لـە بەردەسـتدا نیـە بـۆ ئـەوەی تایبـەت بـە شـاری سـلێمانی ئـەوە بسـەلمێنین یـا ڕەتبکەینـەوە بـەڵام ڕەنگـە ڕوونـە لـە دابەشـبوونی ژمـارەی ئەوانـەی کـە تووشـبوون بـە سـەر گەڕەکەکانـدا ئەوەمـان بـۆ دەردەخـات کـە زۆربـەی گەڕەکـە هەژارنشـینەکان تووشـی پەتاکـە بـوون و ئەوانـەی کـە بـە گەڕەکـە دەوڵەمەنـدەکان ناسـراون، کەمتـر تووشـی پەتاکـە بـوون و ژمـارەی ئەوانـەی کـە لـەو گەڕەکانـە تووشـی پەتاکـە بـوون کەمتـرن بـە بـەراورد بـە گەڕەکەکانـی تـری شـارەکە.

## کار:

جـۆری کاری ئـەو کەسـانەی کـە تووشـی کۆلێـرا دەبـن، کۆمەڵێـک زانیـاری گرنـگ ئاشـکرا دەکات لەسـەر ئـەو هـۆکار و فاکتەرانـەی کـە دەبنـە هـۆی بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـیەکە. وەکـو لـە **گرافـی ژمـارە ٦** دەردەکەوێت. بەداخـەوە ڕێژەیەکـی زۆری ژمـارەکان نەزانـراوە و لەلایـەن بەڕێوەبەرایەتـی تەندروسـتیی سـلێمانیەوە کۆنەکراوەتـەوە. بۆیـە دەشـێت ئـەم ژمارانـە بـە ڕوونـی ئـەوە پیشـاننەدەن کـە لەسـەر ئـەرز دەگوزەرێـت بـەڵام وێنەیەکـی لێڵمـان پـێ دەبەخشـەن لەسـەر ئەوانـەی کـە بـە زۆری تووشـی کۆلێـرا بوون.




گرافی ژمارە ٦

دابەشبوونی حاڵەتەکانی کۆلێرا بە گوێرەی کارکردنیان

وەکو لە وێنەکەدا دەردەکەوێت، زۆربەی ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون، یا ئافرەتی ماڵەوەن یا قوتابین. ئەم دۆزینەوە، هاوتایە لەگەڵ ئەو دۆزینەوانەی لە وڵاتەکانی تردا ئاشکرا کراوە سەبارەت بەوەی چی پیشەیەک یاخود چی توێژێک لە توێژەکانی تر بە زۆری تووشی کۆلێرا دەبن. بۆ نموونە لە چەند توێژینەوێکە کە لە هەریەکە لە وڵاتەکانی هیند و بەنگەلادش کراون، دەرکەوتووە کە بە هەمان شێوەی کوردستان، ئافرەتی ماڵەوە و قوتابی دوو ئەو توێژەن کە لە بەردەم زۆرترین مەترسی تووشبووندان بە کۆلێرا.

(Glass et al1982 ‹; Singh et al1995 ‹)

ئەو هۆکارانەی کە دەشێت لێرەدا بیری لێ بکەینەوە بۆ ئەوەی ئاخۆ بۆچی ئافرەتی ماڵەوە و قوتابی زۆرترین ئەوانەن کە تووشی کۆلێرا دەبن، دیسان پەیوەندییان بە ئاوی خواردنەوە هەیە. ئاشکرایە کە ئافرەتی ماڵەوە زیاتر لە هەر کەسێکی تر لە ماڵەوە دەمێنێتەوە و زیاتر لە هەر ئەندامێکی تری خێزان ئاو بەکاردەهێنێت. بەکارهێنانی ئاو تەنها بۆ خواردنەوە نیە، بەڵکو بۆ پاکردنەوەی ماڵەوە و شوشتنی جل و قاپ و قاچاغ... هتد. بۆیە تووشبوونی ئافرەتی ماڵەوە بۆ خۆی بەڵگەیەکەی گەورەیە لەسەر ئەوەی کە ئاوی خواردنی ماڵان پیس و بەکەڵکی خواردنەوە نایەت و سەرچاوەی سەرەکی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرایە.

هاوکات، دەکرێت هاتنی قوتابی بە پلەی دووەم لە ئەوانەی کە تووشی کۆلێرا بوون، دیسان بەوە لێکبدرێتەوە کە ئەو منداڵانەی لە تەمەنی قوتابین، وەکو ئافرەتی ماڵەوە زۆرترین بەرکەوتنیان هەیە لە گەڵ ئاوی خواردنەوە. بۆیە پیسبوونی ئاوی خواردنەوە لە پاڵ ئافرەتی ماڵەوە، ئاساییە کە یەکەمین کەس کە تووشی بێت منداڵ بێت یا

قوتابی بێت. هەروەها یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ئەو دۆزینەوەی کە بۆچی قوتابی تووشی کۆلێرا دەبێت بریتیە لە پیسبوونی ئاوی خواردنەوەی قوتابخانەکان (Hawler ,2012) دیارە لە میدیاکانەوە چەند جارێک باسی پیسبوونی ئاوی خواردنەوەی قوتابخانەکان کراوە، بەڵام لایەنە پەیوەندیدارەکان و بە تایبەتی وەزارەتی تەندروستیی و وەزارەتی پەروەردە هیچ گرنگیەکیان بەو پرسە نەداوە و ئەوانە تاوانباری سەرەکین لەوەی کە کەسانێکی بێ تاوانی وەکو قوتابی بەهۆی گەندەڵی و ئیهمالی و پشتگوێخستنی دەزگا پەیوەندیدارەکانەوە تووشی کۆلێرا دەبن.



وێنەی ژمارە ٣

قوتابیەک لە ئاوی قوتابخانە دەخواتەوە

## وەرزی ساڵ و ساڵەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا:

یەکێک لەو زانیاریە گرنگانەی کە دەتوانیت یارمەتیمان بدات بۆ دۆزینەوەی هۆکارە بنەڕەتییەکانی بڵاوبونەوەی کۆلێرا، ئەو مێژوو و وەرزانەی ساڵە کە پەتاکەی تێدا بە چڕی بڵاودەبێتەوە. چاوخشاندنێکی

خێرا بەو مێژوویانەی کە کۆلێرای تێیدا بڵاوبووتەوە لە عێراقدا بۆمان دەردەخات کە پەتاکە هەر دە ساڵ جارێک دەگاتە ترۆپکی خۆی. هەرچەندە لە نێوان هەر تروپکێک و ئەوی تردا ژمارەیەکی کەمی هاوڵاتیان تووشی نەخۆشیەکە دەبن بەڵام وەکو لە گرافی ژمارە ٧ دەردەکەوێت، تاوەکو ساڵی ٢٠٠٥، هەر دە ساڵ جارێک ژمارەکە دەگەیشتە تروپکی خۆی. دوای ساڵی ٢٠٠٥ەوە، ژمارەی ئەوانەی کە لە هەر بڵاوبوونەوەیەکی نەخۆشیەکەدا تووشدەبوون زیادیکردووە و هەروەها ماوەی نێوان پەتایەک و ئەوەی تریان کەمیکردووەتەوە.




گرافی ژمارە ٧

ژمارەی ئەوانەی تووشی کۆلێرا بوون لە عیراقدا لە نیوان ساڵەکانی ١٩٦٧-٢٠١٣

سەرچاوە: بە دەستکارییەوە (Khwaif et al, 2010)

زۆربـەی ئـەو زانیاریانـەی لـە بەردەسـتدان دەربـارەی بڵاوبوونـەوەی پەتاکـە لـە عێـراق و کوردسـتاندا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەن کـە نەخۆشـیەکە لـە کۆتایـی هاویـن و سـەرەتای پایـزدا بڵاودەبێتـەوە (Khwaif et al .2012).

بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـەو وەرزانـەدا پەیوەنـدی بـە بڵاوبوونـەوەی سـکچوون و ڕشـانەوە هەیـە لـە هەمـان وەرزدا. وەکـو لـە گرافـی ژمـارە ٨ ژمـارەی ئەوانـە بکەیـن کـە لـە سـاڵی ٢٠١٢دا لـە پارێـزگای سـلێمانی تووشـی سـکچوون و ڕشـانەوە دەبـن، دەبینیـن کـە ژمارەیەیـان بـە شـێوەیەکی چـڕ لـە ناوەڕاسـتی مانگـی نـۆدا بەرزبـووەوە و لـە کۆتایـی مانگـی دەدا هاتـە خـوارەوە.




گرافی ژمارە ٨

ژمارەی تووشبووان بە سکچوون لە پارێزگای سلێمانی لە ساڵی ٢٠١٢:

سەرچاوە: ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی

## سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە:

وەکو داتا و ژمارەکانی تر، سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی ئەو کەسانەی کە تووشی کۆلێرا بوون، کۆمەڵێک زانیاری گرنگمان پێدەبەخشێت لەسەر هۆکاری بڵاوبوونەوەی کۆلێرا.

گرافی ژمارە ٩ ئەو سەرچاوانە دەستنیشاندەکات کە ئەو کەسانە لێیدەخۆنەوە کە تووشی کۆلێرا بوون. وەکو لە وێنەکەدا دەردەکەوێت، سەرچاوەکان دابەشکراوە بۆ سەر ئاوی بۆری، ئاوی بیر، ئاوی بیر و بۆری، ئاوی تەنکەر ، ئاوی بوتڵ، ئاوی بوتڵ و بۆری، ئاوی بۆری و تانکەر.




گرافی ژمارە ٩

سەرچاوەی ئاو خواردنەوەی تووشبووانی کۆلێرا

ئـەو ژمارانـەی لـە وێنەکـەدا دەرکەوێـت، بەڵگەیەکـی گـەورەن لەسـەر سـەرچاوەی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە کوردسـتاندا. ئـەو ژمارانـە هیـچ گومانێـک ناهێڵنـەوە بـۆ ئـەوەی کـە سـەرچاوەی سـەرەکی بڵاوبوونـەوەی کۆلێرا لـە کوردسـتاندا، ئـاوی ماڵانـە. لـە کـۆی ١٦٠ کـەس کـە داتامـان لـە بەردەسـتدا هەیـە لەسـەریان ١٥٠یـان لـە ئـاوی بـوری مـاڵان خواردوویانەتەوە. ئەمـە نزیکـەی ٩٤٪ی کـۆی ئـەو کەسـانە دەکات کـە تووشـی کۆلێـرا بـوون. هـاوکات ئـەو ڕێـژە و ژمارانـە سەرسـوڕهێنەر نیـن ئەگـەر بـەراوردی بکەیـن بـە ئەزموونـەی زۆربـەی ئەوانـەی کـە لـە کوردسـتاندا دەژیـن و زۆربـەی دانیشـتوون و هاوڵاتیـان ئـاوی بـۆری مـاڵان بەکاردەهێنـن بـۆ خواردنـەوە و جێبەجێکردنـی پەیداویسـتیە ڕۆژانەکانـی تـر.

# کورتەی بەشی چوارەم




- ڕوودانــی کۆلێــرا بۆخــۆی بەڵگەیەکــی بەهێــزە لەســەر ئــەوەی کــە ئــاوی خواردنــەوەی مــاڵان لــەو شــار و شــوێنانەی کــە کۆلێــرای تێــدا بڵاودەبێتــەوە پیســە و بــۆ خواردنــەوە ناشــێت
- لــە ســەرەتای مانگــی نــۆی ٢٠١٢دا ڕەنگــی ئــاوی خواردنــەوەی مــاڵان تێکچوو.

- گۆڕانی ڕەنگ و بۆن و تامی ئاوەی خواردنەوەی شاری سلێمانی و دەوروبەری، بەڵگەن لەسەر پیسبوونی ئاوی خواردنەوە.
- دەزگا پەیوەندیدارەکان زانیاری هەڵەیان لەسەر ئەوە بڵاوکردەوە کە گوایە سەرەڕای گۆڕانی ڕەنگی ئاوی خواردنەوەی ماڵان، بەڵام هێشتا ئاوەکە بۆ خواردنەوە دەشێت.
- دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ تاوانبارن لە بڵاوبوونەوەی پەتای کۆلێرا لە شاری سلێمانیدا.
- لە ساڵی ٢٠٠٩ەوە و بە توێژینەوە سەلمێنراوە کە ئاستی کواڵیتی ئاوی دەریاچەی دووکان هاتووەتە خوارەوە.
- ئاوی دەریاچەی دووکان تێکەڵی ئاوەڕۆ و پیساییەکانی ناوچەی دووکان دەبێت.
- کۆمەڵێک خەسڵەتی ئاوی دووکان لە خوار ستاندارده جیهانییەکانەوەن وەکو Electrical Conductivity، Total Hardness…etc
- بەکتیریاری کۆلێرا لەو نموونانەی لە دەریاچەی دووکان وەرگیراوە دۆزراوەتەوە.
- لێدوانی جیاجیا و ناکۆک لە نێوان دزگا تەندروستییەکان و دەزگا تایبەتەکانی ئاو دەدرێت.
- پێش سەرهەڵدانی کۆلێرا ژمارەیەک خۆپیشاندان و نارەزایەتی لە شاری سلێمانی ڕوویاندا بە هۆی کەمی ئاوی خواردنەوە.
- کەمی ئاوی خواردنەوە بۆ خۆی فاکتەرێکی بەهێزە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.
- زنجیرەی ڕووداوەکان بە کەمبوونەوەی ئاوی خواردنەوە

دەستپێکرد و دواتر گۆڕانی ڕەنگی ئاوی خواردنەوە بە دواداهات و پاشان هەڵکشانی ژمارەکانی سکچوون و ڕشانەوە و دواجار بڵاوبوونەوەی کۆلێرا.

- بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بەهۆی کۆمەڵێک هۆکاری تایبەت بە سیستمی تەندروستییەوە بڵاودەبێتەوە کە پەیوەندییان بە حکومڕانی تەندروستیی و داهاتی تەندروستیی وژێرخان ودەرمان وتەکنلۆژیا وزانیاری وهێزی کاری تەندروستییەوە هەیە.

ئەگەر هەڵسەنگاندێکی زانستی بۆ سەرهەڵدانی کۆلێرا لە کوردستاندا بکەین، دەبێت لە سیستمی تەندروستیەوە دەستپێبکەین. لە سیستمی تەندروستیشدا دەبێت قسە لەسەر ئەو نوخبە و شێواز و میکانیزمانە بکەین کە حکومڕانی سیستمەکە دەکات. ئەو نوخبەیەی حکومڕانی سیستمی تەندروستی دەکات، دابڕاو و نامۆیە بە هاوڵاتی ئاسایی و کێشەکانی. ئەوەندەی لە خەمی نەخۆشخانە بووە، هێندەی لە خەمی نەخۆش نەبووە. ئەوەندەی لە خەمی بینای نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستیی بووە ئەوەندە لە خەمی تەندروستیی خۆی نەبووە. ئەوەندەی شەونخونی بە دیار پەردەپۆشکردن و شاردنەوەی کێشەکان کردووە و وێنەیەکی ڕۆمانسی بۆ سیستمی تەندروستیی کێشاوە، هێندە لە خەمی دایەلۆگێکی ڕاستگۆ نەبووە لەسەر ئەو کێشانە بە مەبەستی چارەسەرکردنیان. لەمەیاندا نوخبەکە کە باگراوندێکی پزیشکیی هەیە، ئەو بنەما سەرەکییە پزیشکییەی لە بیر کردووە کە سەرەتای هەموو چارەسەرێک دەستنیشانکردنە. ئەم نوخبەیە ئەوەندەی لە هەڵپەی ناوی گەورە و نەشتەرگەری سەروگەورە و ئامێری گرانبەها بووە، ئەوەندە لە خەمی ئاوی پاک و پاک و خاوێنی و خواردنی تەندروست و دەرمانی کواڵیتی بەرزەوە نەبووە. ئەوەندەی بە لوتبەرزی و خۆ بە زلزانینەوە

هـاواری بەسـەر هاوڵاتیـان كـردووە و سەرزەنشـتی كـردوون لەسـەر ئـەوەی وەكـو خۆیـان دەڵێـن خەڵكەكـە ناهۆشـیار و دواكەوتـووە، ئەوەنـدە خـۆی ماندوونەكـردووە بـۆ بڵاوكردنـەوەی هۆشـیاری و دروسـتكردنی گفتگۆیەكـی نـەرم لەگـەڵ هاوڵاتیانـدا و باوەشـكردنەوە بـۆ خـەم و داواكارییەكانیـان. هێنـدەی لـە خەمـی ناوبانگـی فـلان پارێـزگا و فیسـار شـاربووە، ئەوەنـدە لـە خەمـی تەندروسـتیی و ژیـان و گوزەرانـی ئـەو خەڵكـە نەبـووە كـە لـەو شـار و پارێزگایانـەدا دەژیـن.

ئـا ئەمانـەن كـە بەشـێكن لـە هۆكارەكانـی بڵاوبوونـەوەی كۆلێـرا. میكرۆبی كۆلێـرا دەشـێت لـە ژینگـەی پێشـكەوتووترین وڵاتـدا هەبێـت، بـەڵام ئـەوە حكومڕانـی و بەڕێوەبردنێكـی زانسـتی و دڵسـۆز و لـە خۆبـووردوو و ناحیزبیـە كـە بەرژەوەندییەكانـی نەتـەوە و كۆمەڵـگا لەسـەروو هەمـوو شـتێكی تـرەوە دادەنێـت كـە ڕێگـرە لـە بڵاوبوونـەوەی پەتاكـە. تـا ئـەو نوخبەیـەی حكومڕانی سیسـتمی تەندروسـتیی دەكات گۆڕانـی بەسـەردا نەیـەت، دوور نیـە لـە كۆلێـرا مەترسـیدارتریش ڕوومـان تێنـەكات.

بـەڵام كۆلێـرا تەنهـا بەهـۆی پیسـیی ئـاوی خواردنـەوە و پابەندنەبـوون بـە پرنسـیپە سـەرەتاییەكانی پـاك و خاوێنـی و دەستشوشـتنەوە بـڵاو نابێتـەوە. كۆلێـرا هاوڕێـی ناكارامەیـی و گەندەڵـی و بـێ باكییـە لـە حوكمڕانیـی سیسـتمی تەندروسـتییدا. لێرەدا تیشـك دەخەینـە سـەر پێكهاتـە و ئەركێكـی تـری سیسـتمی تەندروسـتیی كـە بـە بـڕوای ئێمـە ڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ زەمینـەی بڵاوبوونـەوەی كۆلێـرا خۆشـدەكات. چۆنیەتـی كۆكردنـەوە و دەخیلەكـردن و خەرجكردنـی داهـات و خەرجیـی بـۆ سیسـتمی تەندروسـتیی لـە سـەنتەری هـەرە گرنگتریـن فاكتەرەكانی پاراسـتنی تەندروسـتیی هاوڵاتیان و ڕێگەگرتنـن لـە بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـی و درمـی خەتەرناكـی وەكـو كۆلێـرا.

كەمیـی ئـەو پـارە و داهاتـەی بـۆ تەندروسـتیی وەكـو حكومـەت

خەرجی دەکەین لە گاڵتەجاری دەچێت وەک لە نیشانەی گرنگیدانێکی جیددی ئەم حکومەتە بە تەندروستیی هاونیشتمانیانی خۆی. تەنها لە دواکەوتووترین وڵاتە ئەفریقیەکاندا حکومەت ٥٪ی بودجەی خۆی بۆ تەندروستیی هاوڵاتیان خەرجدەکات وەکو ئەوەی لە کوردستاندا هەیە. تەنانەت زۆرێک لە وڵاتە ئەفریقیەکانیش بەڵێنیان داوە کە ئەو خەرجیە لە ١٥٪دا نزیکبکەنەوە. بۆ ئەوەی ئەوە بکەن، زۆرێک لە شارەزا نێودەوڵەتیەکان ئامۆژگاری دۆزینەوەی سەرچاوەی وەکو باجی سەر جگەرە و مادە کحولیەکان وخواردن و خواردنەوە زەرەربەخشەکان و باجی سەر کڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبیل دەکەن. ئەو سەرچاوانە دەشێت دواتر لەو نەخۆشی و ڕووداوانە خەرجبکرێن کە لە ئەنجامی جگەرەکێشان و قەڵەویی و خێرایی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل... هتد تووشی کۆمەڵگا دەبن. سەبارەت بە کۆلێرا دەکرێت باجێکی تایبەت بۆ پابەندنەبوون بە ڕێنمایی و ستانداردە تەندروستییەکانی پاک و خاوێنی دابنرێت و دواتر لە کەمپین و پرۆژەی تایبەت بەو بوارە خەرجبکرێت.

زیادکردنی داهاتی تەندروستیی بێ پلان و بەرچاوڕۆشنیەک لەسەر ئەوەی کێ و چۆن و لە کوێ داهاتەکە کۆدەکرێتەوە و دەخیلەدەکرێت سوودی نیە. کوردستان زیاد لە دەخیلەکەی تەندروستیی هەیە؛ وەزارەتی تەندروستیی گەورەترینیانە، بەڵام وەزارەتی شەهیدان و حیزبەسیاسیەکان و ڕێکخراوەکان و تەنانەت کەسە دەوڵەمەند و بازرگانەکان هەر یەکە دەخیلەکەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ تەندروستیی. ئەم دۆخە دەبێت کۆتایی پێ بێت و تەنها یەک دەخیلەمان هەبێت کە بەرژەوەندی و چاکەی گشتی کۆمەڵگە پیوەری سەرەکی چۆنیەتی خەرجکردنی داهاتی ئەو دەخیلەیە بێت. دیسان یەکخستنی دەخیلەکان بە بێ بنبڕکردنی گەندەڵی و بێکاری دەمامەکدار و تەواوی ئەو هەدەردانەی لە سیستەمی تەندروستییدا هەیە کارێکی بێ هودەیە. کۆلێرا وەختێک بڵاودەبێتەوە کە

ئەو کارمەندەی بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی تەندروستیی لە خوێندنگاکاندا دانراوە دەوام نەکات.

کە داهاتی تەندروستییمان زیادکرد و دواتر لە یەک دەخیلەدا کۆمانکردەوە، دەبێت ژیرانە داهاتەکە خەرج کەین. شێتیە لە هەرێمێکدا چەند ساڵ جارێک کۆلێرا بڵاوبێتەوە، سەنتەری نەشتەرگەری دڵ بکەینەوە، شێتیە ئاوی خواردنەوەی هاونیشتیمانیان کلۆری تیا نەبێت کەچی تۆ ئامێری ئاخیرمۆدێلی لەرەلەری موگناتیسی هاوردە بکەیت.!!!. لوبنان لە ئەڵمانیا زیاتر نەشتەر (جەراح)ی دڵی هەیە، بەڵام ئایا ئەوە پێوەرە بۆ ئەوەی بڵێین لوبنان لە ئەڵمانیا تەندروستترە؟؟. ئەمریکا لە هەموو وڵاتێک لە جیهاندا زیاتر پارە لە تەندروستییدا خەرج دەکات بەڵام لە دواوەی وڵاتە پێشکەوتووەکانە لە پێوەرە ناسراوەکانی تەندروستییدا. دەبێت پەیداویستیە تەندروستیی و پزیشکیەکانمان قیبلەنمای شێوازی خەرجکردنی داهاتی تەندروستییمان بێت. ئەو شوێنەی زیاترین پەیداویستی هەیە، زۆرترین خەرجیی بۆ بڕوات.

میکانیزمەکانی کۆکردنەوە و دەخیلەکردن و خەرجکردنی داهاتی تەندروستیی لە کوردستاندا لە خودی کۆلێرا کۆنترە. بۆیە دوور نیە لە کۆلێرا ترسناکتریش ڕوومان تێنەکات. بەبێ زیادکردنی سەرچاوەکانی داهات بۆ تەندروستیی و یەکخستنی هەموو دەخیلەکان و عاقڵانەترکردنی خەرجکردنی ئەو داهاتە ئەستەمە بتوانین وەکو کۆمەڵگا تەندروستیی خۆمان بپارێزین و خۆمان و نەوەکانی دوارۆژ بۆ نەزانراوەکانی داهاتوو ئامادەبکەین.

بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بە تەنها دەرکەوتەی گەندەڵی و ناکارامایی حکومڕانی تەندروستیی و کەمیی داهات و کۆڵەواریی لە کۆکردنەوە و هەڵسەنگاندن و بەکارهێنانی داتا و زانیاری لە سیستمی تەندروستییدا

نیـە. کۆلێـرا لـە وڵات و ناوچەیەکدا بڵاودەبێتـەوە کە دنیابینی و سیاسـەتێکی ڕوونــی لەســەر مامەڵەکــردن لەگــەڵ پێکهاتەیەکــی گرنگــی سیســتمی تەندروســتیی وەکــو هێــزی کار نەبێــت. هەڵاتنــی وەزارەتــی تەندروســتیی لــەو دنیــا کێشــەیەی کــە بەرۆکــی کارمەندانــی تەندروســتیی و پزیشــکانی گرتــووە لــە کوردســتاندا و پەنــا بردنــە بــەر هاوردەکردنــی کارمەنــدی فلیپینــی بەرچاوڕوونیەکــی ناوازەمــان پێدەبەخشــێت لەســەر ئــەوەی ئاخــۆ بۆچــی کۆلێــرا بڵاودەبێتــەوە.

مامەڵەکردنــی سیســتمی تەندروســتیی ئێمــە لەگەڵ هێزیکاری تەندروســتیی (کارمەنــدان و پزیشــکان... هتــد)، مامەڵەیەکــی پاســیڤی نازانســتی و تەنانەت بێکەڵکــە. مامەڵەکــە لەوێــەوە دەســتپێدەکات کــە هێزیــکاری تەندروســتیی ئێمــە فێــری تەندروســتیی و پزیشــکیی دەکرێــت تــا ئــەو کاتــەی خانەنشــین دەبێــت. ئــەو زانســتەی لــە ناوەندەکانــی فێرکردنــی تەندروســتیی و پزیشــکیدا (ئەزبەردەکرێــت) بــەلای کەمــەوەوە دەیەیــک کۆنتــرە لــەوەی کــە لــە دنیــای ئەمــڕۆدا بــاوە. ســەرباری ئــەوە، لــەو چرکەیــەی کارمەنــد و پزیشــکان لــە پەیمانــگا، کۆلێــژ... هتــد دەردەچــن، ئیتــر دەدرێــن بــە دەســتی قــەدەرەوە و هیــچ ڕاهێنــان و چاودێریــەک ناکرێــن. یەکێــک لــە گرنگتریــن کۆڵەکەکانــی سیســتمێکی تەندروســتیی ســەرکەوتوو هەبوونــی چاودێــری و ڕاهێنــای بەردەوامــە کــە هێچیــان لــە کوردســتاندا بوونیــان نیــە. چاودێــری بــەو مانایــەی کــە هەمــوو کارمەنــد و پزیشــکێک کەســێک یــا زیاتــر هەبێــت کــە چاودێــری ورد و درشــتی کارەکانــی بــکات و ڕاپــۆرت ئامادەبــکات بــۆ ســەروخۆی لەســەر لایەنــە پۆزەتیــڤ و ئــەو لایەنانــەی کــە دەکرێــت باشــتربکرێن.

قەیرانەکانــی هێزیــکاری تەندروســتیی ئێمــە لەوێــدا کۆتایــی نایــەت کــە ڕاهێنــان و چاودێــری شــیاو ناکرێــن، کێشــەکە لــە شــێوازی دامەزرانــدن و دابەشــکردن بەســەر ناوچــە جیاجیاکانــدا گەورەتــرە. ئێمــە ســوپایەک کارمەنــد

و پزیشکمان هەیە کە یا دەوام ناکەن یاخود کارێکی سەرپێی و چەند سەعاتی دەکەن. لە ڕاستیدا سیستمی تەندروستیی ئێمە، ئەوەندەی بۆ دامەزراندن و دابینکردنی مووچەیە بۆ ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان، ئەوەندە بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاری تەندروستیی نیە. پشکنینی لیستی کارمەندان و پزیشکانی تەنها یەک بنکەی تەندروستیی بەسە بۆ ئەوەی بزانین کە چەندێکیان بە تەواوی کار دەکەن و چەندێکیان (بن دیوارن). بارودۆخی پزیشکە پسپۆرەکانیش لەوە باشتر نیە. زۆرێک لە پزیشکە پسپۆرەکانمان کاتێکی کەم بۆ نەخۆشخانە گشتیەکان تەرخان دەکەن و زیاتر سەرقاڵی بینینی نەخۆشن لە کەرتی تایبەتدا.

هۆکاری تەشەنەکردنی «بێکاری دەمامکدار» لە ناو سیستمی تەندروستیی ئێمە، هەڵەی کارمەندان و پزیشکان نیە. کارمەندان و پزیشکانی ئێمە لە خۆڕا هەوڵی ئەوە نادەن کە کەمترین کات لە ناو سیستمی تەندروستیی بەسەربەرن و زیاترین کات یا لە دەرەوەی سیستمەکە بن یا لە شوێنێکی تری کەرتی تایبەت کار بکەن. سیستمی تەندروستیی ئێمە وەکو ماڵێک و خێزانێکی پڕ لە ئاشوب و ناڕێکیە کە منداڵەکانی حەزیان بەوە نیە کاتی تیا بەسەربەرن. کە سیستمی تەندروستیی نەتوانێت هەلی باشی ڕاهێنان و مووچەی باش و ڕێز و حورمەت بۆ کارمەندان و پزیشکان بگەڕێنێتەوە، ئاساییە کە ئەمانەی دوایی لە سیستمەکە بتۆرێن و لە شوێنی تردا شانسی خۆیان تاقیبکەنەوە.

هاوردەکردنی کارمەندی فلیپینی نەک تەنها چارەسەری ئەو کێشانە ناکات کە لەسەرەوە باسمان کرد، بەڵکو کێشەکان ئاڵۆزتر و قووڵتر دەکاتەوە. چارەسەرەکان لەوێیەوە دەستپێدەکەن کە موچەی کارمەندان وپزیشکان زیادبکرێت و ڕاهێنان و چاودێری بکرێن و بە پێی پەیداویستی دابەشبکرێن. لە ڕاستیدا ئەم هەنگاوەی وەزارەتی تەندروستیی زۆر شتمان

پـێ دەڵێـت لەسـەر ئـەوەی بۆچـی کۆلێـرا لـە کوردسـتاندا بڵاودەبێتـەوە. کێشـەکە ئـەوە نیـە کـە لـە فلیپیـن کۆلێـرا نیـە، کێشـەکە لـە کوردسـتانە و پێویستی بـە چارەسـەرێکی خۆماڵـی هەیـە.

کۆلێـرا لـە شـوێن و وڵات و ناوچەیکدا بڵاونابێتـەوە کـە بە تەنها گەندەڵی و ناکارامەیـی و کەمیـی داهـات و کێشـە لـە هێزیـکاری تەندروسـتیی تیـا بێـت. شـوێن و وڵات و ناوچەیـەک تووشـی لەعنەتـی کۆلێـرا دەبن کـە نەزانـن مامەڵـە لەگـەڵ ئاگرێکدا بکـەن کـە نـاوی دەرمانـە. ئاگرێـک کـە ڕەحمەتـە ئەگـەر بزانیـت مامەڵـەی لەگـەڵ بکەیـت، بـەڵام لەعنـەت و مەترسـییەکی گـەورە ئەگـەر نەزانیـت. دەرمـان لـە کوردسـتاندا کـت و مـت ئـەو ئاگرەیـە کـە لـە دەسـتدەرچووە و کابینـە بـە دوای کابینـە بـۆی ناکوژێتـەوە.

کێشـە و سەرئێشـەی ئێمـە لەگـەڵ ئـەم ژەهـرە بەسـوودەی نـاوی دەرمانـە تەنها لە قاچاغیی پێوەکردن و هەڕەمەکی لە دابەشـکردن و بڕ و چۆنیەتی و کۆتایـی بـە بەکارهێنـان نیـە. کێشـەکە لـەوە قوڵتـرە و پەیوەنـدی بـەو وێنایە هەیـە کـە لـە خەیاڵدانـی ئێمـەدا بـۆ دەرمـان کێشـراوە و دەکێشـرێت. لای ئێمـە دەرمـان ئـەو فریـادرەس و دارە سـیحریەیە کـە دەتوانێـت و چاوەڕوانـی ئـەوەی لێدەکرێـت «عەلـەم» لـە لـەش و دەروون... هتـد نەهێڵێـت. ئـەو وێنایـە جیاوازییەکـی جەوهـەری هەیـە لەگـەڵ وێنـای ڕۆژئـاوا بـۆ هەمـان کەرەسـتە. هەرچەنـدە قورسـە لـە پەیوەنـد بـە بابەتێکـی ئاڵـۆزی وەکـو ئەمـەی لەژێـر دەسـتماندیە ئەنجامگیـری گشـتگیر بکەیـن، بـەڵام ئاسـانە دوو تێگەیشـتنی جیـاواز بـۆ دەرمـان لای ئێمـە و لـە ڕۆژئـاوادا بدۆزینـەوە. لـەوەی دواییـدا، دۆزینـەوەی دەرمـان کردنـەوەی «بۆکسـێکی پاندۆرایـە» کـە لەگـەڵ کردنەوەیـدا هەرچـی شـەڕ و ناخۆشـی هەیـە بڵاودەبێتـەوە. بـۆ گەیشـتن بـەو تاقـە سـوودەی لـە بنـی بۆکسـەکدا هەیـە، ڕۆژئـاوا لەڕێـی تاقیکردنـەوە لەسـەر ئـاژەڵ و دواتـر لەسـەر مـرۆڤ، خراپیـی و ناخۆشـی و زەرەرەکانـی

دۆزیوەتـەوە و دەتوانێت خـۆی لـێ لابدات. بـەڵام لای ئێمـە وێنـای دەرمـان تەنها یەکسـانە بـەو تاقـە سـوودەی لـە بنـی بۆکسـەکدا هەیـە و بـێ ئاگایـن لـە خراپییەکانـی تـری نـاو بۆکسـەکە. کـەم نیـن ئـەو پزیشـکانەی کـە گومـان دەخرێتـە سـەر شـارەزابوونیان و سەرزەنشـت دەکرێـن چونکـە دەرمانـی کـەم دەنووسـن.

کێشـەکانی تـری دەرمـان کۆمەڵـە کێشـەیەکی تەکنیکیـی ڕووتـن کـە لـە گـەڵ ورد خوێندنـەوە و دەستنیشـانکردنی هـۆکارەکان و دیاریکردنـی چارەسـەرەکان و چاودێـری و هەڵسـەنگاندنی ئـەو چارەسـەرانە، زەحمـەت نیـە چاکبکرێـن. بـەڵام وەکـو هەمـوو کێشـەیەکی تـر، ئەوانـەی سـەرەوە بـە کۆمەڵێـک فاکتـەری ئابـووری و سیاسـی ئاڵـۆز کـراون و شـوێنی ئێـرە نیـە باسـیان بکەیـن. ئەوەنـدە بەسـە بڵێیـن کـە ئـەم کابینیـەی حکومـەت گفتـی دابـوو کێشـەکانی دەرمـان چارەسـەر بـکات، و زۆری نەمـاوە کابینەکـە ماڵئاوایـی بـکات، بـەڵام زۆری مـاوە کێشـەکانی دەرمـان چارەسـەر بکرێـت.

کۆلێـرا یەکێکـە لـەو شـەڕ و نەگبەتییانـەی لەگـەڵ کردنـەوەی بۆکسـی پانـدۆرای دەرمانـدا تووشـمان دەبێـت. دەرمـان تەنهـا چارەسـەری نەخۆشـی نـاکات، بەڵکـو بـۆی هەیـە نەخۆشـی بڵاوبکاتـەوە و بەرگـەری نەخۆشـیی بـۆ چارەسـەرکردن زیادبـکات. ئـەو پرسـیاری کـە ئاخـۆ کۆلێـرای کوردسـتان بەرگـەری بـۆ ئـەو دەرمانانـە پەیـدا کـردووە کـە بەکاردەهێنرێـت یەکێکـە لـە پرسـیارە گرنـگ و وەڵامنـەدراوەکان کـە پێویسـتیان بـە توێژینـەوە هەیـە.

بـەم وتـارە، کۆتایـی بـە زنجیـرەی «بۆچـی تووشـی کۆلێـرا بوویـن» دەهێنیـن. کاتـی ئـەوە هاتـووە، بـەلای کەمـەوە لێـرەدا ئـەم پرسـیارە بەجێبهێڵیـن و لـە شـوێنی تـردا بـەردوام بیـن لـە کردنـی پرسـیارەکە و گەڕانـی بـەردەوام بـە دوای وەڵامـدا. ئیشـکالیەتی کێشـە تەندروسـتییەکان ئەوەیـە کـە لـە نهێنـی کارکتەرێکـی شـارلۆک هۆڵمـز یـا چیرۆکێکـی ئەگاپـا

کریستی ناچن کە لە کۆتاییدا بکەر و تاوانبار و هۆکارەکان بدۆزرێنەوە. ئیشکالیەتەکە ئەوەیە کە سیستمی تەندروستیی ئێمە روحیەتێکی هۆڵمزیانەی نوقستانە بۆ چێژ وەرگرتن لە کردنەوەی گرێ کوێرەکان و هەڵهێنانی مەتەڵەکان و ئاشکرا کردنی نهێنیەکان. بە بێ ئەو روحیەتە، هەتا هەتایە نە ئەزانین بۆچی تووشی کۆلێرا بووین و نەش ئەو لەعنەتە لە کۆڵمان دەبێتەوە.

بڵاوبوونەوەی نەگبەتیی کۆلێرا لە کوردستاندا، بە تەنها دەرئەنجامی ناکارامایی لە حوکمڕانی سیستمی تەندروستیی و کەمیی داهات و ناعەقڵانیەت لە خەرجکردنی ئەو داهاتەدا نیە. داخوران و دارمانی پێکهاتەیەکی تری سیستمی تەندروستیی ئێمە، کە سیستمی زانیارییە، وەکو هۆکارێک بۆ بڵاوبوونەوەی کۆلێرا هیچی لە گرنگی پێکهاتەکانی تر کەمتر نیە. کێشەکانی سیستمی زانیاری تەندروستیی دەشێت بۆ سەر سێ جەمسەر پۆلێن بکرێن؛ کۆکردنەوە و هەڵسەنگاندن و کارکردن لەسەر داتا.

لە کۆکردنەوەی داتا و ژمارەدا، سیستمی تەندروستیی ئێمە لە تاریکیەکی کوێرکەردا دەژیت. سیستمەکە لە بۆشایەکی زانیارییدا دەگوزەرێت کە ڕاستەوخۆ هۆکارێکی سەرەکی شکستە یەک لە دوا یەکەکان و کارەساتە گەورەکانی وەکو کۆلێرایە. سیستمی تەندروستیی ئێمە وەکو جەستەیەک وایە کە قاچێکی یا دەستێکی یا هەموو لەشی لە ژێر ئاگردایە و ئەو ئاگای لێ نیە. لەشی مرۆڤ سیستمێکی کۆئەندامی دەماری هەیە کە زانیاری زۆر ئاڵۆز لەسەر دەروبەری لەشەکە بۆ میشک دەگوازێتەوە و لەش لە هەموو گەورە و بچووکێکی دەوروبەری ئاگاداردەکاتەوە. بەو پوەدانگەی کە زۆربەی ئەوانەی سەرپەرشتی سیستمی تەندروستیی دەکەن لە توێژی پزیشکانن و پزیشکانیش

گرنگی کۆئەندامی دەمار باش دەزانن، دەبوایە سیستمی تەندروستییش کۆئەندامێکی کارای دەماری هەبووایە بۆ کۆکردنەوەی داتا. جودا لە پێوەرە سەرەتاییەکانی وەکو ڕێژەی مردنی منداڵ و مردنی دایک لە کاتی منداڵبوون و تەمەنی مەزەنەکراو، کە نازانین چەندن، کۆمەڵە زانیاریەکی گرنگی تری وەکو ژمارەی ئەوانەی کە ئاوی پاکی خواردنەوەیان نیە، زانیاری لەسەر ئەوانەی کە توشی کۆلێرا بوون (تەمەنیان، ڕەگەزیان، شوێنی دانیشتنیان، جۆری بەکتیریای کۆلێرا کە تووشی بوون... هتد) بەردەست نیە.

بەڵام کێشەکە تەنها لەوێدا کۆتایی نایەت کە سیستمی تەندروستیی ئێمە داتا کۆناکاتەوە: کێشەکە لەوە قووڵتر و ئاڵۆزترە و پەیوەندی بەو عەقلیەتەوە هەیە کە مامەڵە لەگەڵ ئەو داتا کەمە دەکات کە کۆدەکرێتەوە. زۆربەی جارەکان داتا تەنها بۆ یەک مەبەست کۆکراوەتەوە و ڕاگەیاندراوە، کە ئەویش هەڵنان و بە شان و باڵ پیاهەڵدانی وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا تەندروستییەکان بووە. پێش بڵاوبوونەوەی کۆلێرا، بۆ نموونە، ڕاگەیەندرا کە هەزاران نەخۆش بۆ سکچوون و ڕشانەوە سەردانی نەخۆشخانەکانیان کردووە. هەر لە تۆنی هەواڵەکەوە ئەوەت بۆ دەردەکەوت کە بەشە گرنگەکەی ئەم هەواڵە بەلای دەزگا تەندروستییەکانەوە ئەو ڕاستیە نەبوو کە هەزاران هاوڵاتی نەخۆش کەوتوون و ئەمە زەنگێکی مەترسیدارە، بەڵام ئەوە بوو کە دەزگا تەندروستییەکان پێشوازیان لە هەزاران نەخۆش کردووە و گوایە ئەمە دەبێت جێگای دەستخۆشی و دڵخۆشی بێت. ئەوە بوو دوای ماوەیەکی کەم زانرا کە کۆلێرا هۆکاری بەشێکی زۆری ئەو سکچوونەیە. ئەم نموونەیە پێمان دەڵێت تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی جیاواز بۆ هەمان زانیاری چی کاریگەریەکی لەسەر هەنگاوی داهاتوو هەیە کە کارکردنە لەسەر ئەو داتایانە.

کۆکردنەوە و هەڵسەنگاندنی داتا بە بێ ئەوەی کاری بە دوادابێت هیچ سوودێکی نیە. ئەگەر جەستەیەک بزانێت کە قوڵێکی لەسەر ئاگرە و هەست بە ئازارەکەی بکات، بەڵام نەتوانێت یا نەزانێت چۆن قوڵی ڕاکێشێت، کۆکردنەوە و هەڵسەنگاندنی داتاکە هیچ لەو دەرئەنجامە ناگۆڕێت کە قوڵەکە دەسووتێت. سیستمی تەندروستیی ئێمە وەکو ئەو برادەرەیە کە زۆر بە وردی و هەموو سەرە کاژێرێک فشار و لێدانی دڵی نەخۆشێکی ماندووی دەگرت، کە نەخۆشەکە مرد، پێیان وت بۆ هیچت نەکرد کە بینیت فشاری هاتەخوارەوە، وتی پێیان وتم فشار و لێدانی دڵی بگرە، پێیان نەوتم هیچی بۆ بکە.

گرنگینەدان بە کۆکردنەوە و هەڵسەنگاندن و کارکردن لەسەر زانیاری ئەگەر هیچمان پێ نەڵێت ئەوەمان پێ دەڵێت کە پەتایەکی تری کۆلێرا یا هەر پەتایەکی کوشندەی تر بەڕێوەیە.

## کاردانەوەی دەزگا پەیوەندیدارەکان بۆ پەتاکە:

### ڕێنمایی ڕێکخراوە جیهانییەکان بۆ خۆپاراستن و کۆنترۆڵکردنی کۆلێرا

لەم بەشەدا تیشکدەخەینە سەر ئەو ڕێنماییانەی کە ڕێکخراو و دەزگا تەندروستییە جیهانییەکان بۆ خۆپاراستن و کۆنترۆڵکردنی کۆلێرا دەیانکردووە. دواتر بەراوردێک دەکەین لە نێوان ئەو ڕێنمایانە و ئەو هەنگاوانەی کە وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا تەندروستییەکانی تر لە کوردستاندا ناویانە (یان نەیاناوە). ئەو بەراوردە لە چوارچێوەی هەڵسەنگاندنێکی گشتگیرتر دەکەین بۆ کاردانەوەکانی وەزارەتی تەندروستیی و هەوڵ دەدەین ئەو هەڵسەنگاندنە بەکاربهێنین بۆ ئەوەی لە وانەکانەوە فێرببین. ئامانجی سەرەکی لە کۆی ئەم کارە ئەوەیە کە جارێکی تر کۆلێرا لە کوردستاندا سەرهەڵنەداتەوە، یا ئەگەر

سەریهەڵدایشەوە، بزانین چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکەین یا بەلای کەمەوە لە هەڵەکانی ڕابووردووەوە فێربووبێتین بۆ ئەوەی ئەو هەڵانە دووبارە نەکەینەوە.

لە خوارەوە قسە لەسەر چۆنیەتی دەستنیشانکردن و دۆزینەوەی بڵاوبوونەوەی پەتای کۆلێرا و خۆپاراستن و کۆنترۆڵکردنی پەتاکە و چۆنیەتی چارەسەری نەخۆشییەکە و هەروەها کۆمەڵێک زانیاری دەخەینە ڕوو سەبارەت بە کوتان دژی کۆلێرا و ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی بۆ ئەو شوێن و شار و گەڕەکانەی کە تووشی پەتاکە نەبوون بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە داهاتوودا لە ڕوودانی پەتاکە. ڕێنمایەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی دابەشدەکەین بۆ سەر ئەو ڕێنمایانەی کە پەیوەندییان بە نەخۆشی کۆلێرا بە گشتی هەیە و ئەو ڕێنمایانەی کە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییی لەمەڕ نەخۆشی کۆلێرا لە کوردستاندا خستوویەتە ڕوو:

## ڕێنماییە گشتیەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی لەسەر کۆلێرا:

### دەستنیشانکردن:

وەکو لە بەشی یەکەمدا قسەمان لەسەر کرد، کۆلێرا لەڕێی پشکنینی تاقیگەوە دەدۆزرێتەوە. بەڵام لە حاڵی حازردا چەند شێوازێکی خێراتر هەیە بۆ دەستنیشاناکردنی نەخۆشیەکە کە پێویست بە ڕەوانەکردنی نموونەی پیسایی نەخۆشەکە ناکات بۆ تاقیگە. ئەم شێوازە لە دەستنیشانکردن کە پێی دەگوترێت (Rapid Diagnostic Test-RDT-) کاتێکی زۆر بۆ نەخۆش و پزیشک و کارمەند دەگەڕێنێتەوە و دەتوانێت تەنانەت ژیانی چەندان تووشبوو لە مردن ڕزگاربکات بەهۆی ئەوەی

کە دەتوانێتِ زووتر لە شێوازەکانی تری دەستنیشانکردن، نەخۆشیەکە بدۆزێتەوە. ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی لە حاڵی حازردا لە پرۆسەی بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە پشکنینانەیە (WHO ,c2013) بۆیە پێویستە لەسەر وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا تەندروستییەکانی تری کوردستان دەستوبردبکەن لە بەدەستهێنانی ئەو پشکنینانە و بەکاریانبهێنن بۆ دۆزینەوەی خێرای کۆلێرا لەو نەخۆشانەی کە مەترسی تووشبوونیان بە نەخۆشییەکە لێ دەکرێت. دیارە ئەم جۆرە تاقیکردنەوانە بە تایبەتی بۆ کوردستان سوودێکی ئێجگار گەورەی هەیە ئەگەر ئەوە بهێنینەوە یادی خۆمان کە زۆر جار وەزارەتی تەندروستیی بۆ سەلماندنی هەبوونی نەخۆشییەکە نموونەی نەخۆشی ناردووە بۆ بەغدا یا بۆ وەڵاتانی دەرەوە بۆ دڵنیابوون لە هەبوون یا نەبوونی نەخۆشیەکە (Awene , a2012).

ئەو نەخۆشانەی کە لە ڕێی RDTەوە دەستنیشاندەکرێن دەکرێت بۆ دڵنیابوون لە ڕێی تاقیگەوە پشکنینی تریان بۆ بکرێت. ئەگەر هاتوو ئەو تاقیکردنەوانە دڵنیایان بەخشی لەسەر ئەوەی کە کۆلێرا بڵاوبووەتەوە، ئەوا پێویست بەوە ناکات کە هەموو نەخۆشێک تاقیکردنەوەی بۆ بکرێت. بە پێی ڕێنمایەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی دوای ئەوەی کە دەزگا تەندروستییەکان دڵنیابوون لەوەی کە کۆلێرا بڵاوبووەتەوە دەبێت هەموو نەخۆشێک کە ئەم دوو مەرجەی خوارەوەی بەسەردا جێبەجێدەبێت بە کۆلێرا ئەژماربکرێت:

١. لە شوێنێکدا کە پێشتر کۆلێرای تێیدا بڵاونەبووەتەوە، هەرچی نەخۆشێک کە تەمەنی ٥ساڵان یا زیاتر بوو و تووشی وشکبوونەوەیەکی توند هاتبێت یا هەر نەخۆشێک کە بەهۆی سکچوونی توندەوە گیان لە دەستبدات.

٢. لە شوێنێکدا کە کۆلێرا پێشتر بڵاوبووەتەوە، هەر نەخۆشێک کە

تەمەنی (٥) ساڵان یا زیاتر بوو و کە تووشی سکچوونێکی توند دەبێت ئەگەر هاتوو ڕشانەوەی لەگەڵ بوو یاخود لەگەڵی نەبێت.

تەنها لەو کاتەدا لەوە دڵنیادبیت کە نەخۆشێک تووشی کۆلێرا بووە ئەگەر هاتوو بەکتیریای ڤایبرۆ کۆلێرا جۆری (O1) یا جۆری (O139) لە نەخۆشێکدا دەدۆزرێتەوە کە تووشی سکچوون بوویێت (WHO, c2012).

## خۆپاراستن:

بەشێکی گەورەی هەوڵ و چالاکییەکانی خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلێرا لە دابینکردنی ئاوی پاکی خواردنەوە و پەیداویستیە سەرەکیی و بنەڕەتیەکانی پاک و خاوینیدا خۆیان دەبیننەوە. بڵاوکردنەوەی هۆشیاری تەندروستیی و پاکوخاوێنی و گرنگی دان بە پاک و خاوێنی خواردن و ئاوی خواردنەوە بەشێکی هەرە گرنگی خۆپاراستنن لە کۆلێرا. پێویستە لە سەر دەزگا تەندروستییەکان کە پرنسیپەکانی پاک وخاوێنی وەکو دەستشوشتن بە ئاو و سابون دوای چوونە سەر ئاو و پێش ئامادەکردنی خواردن و نانخواردن بهێننەوە یادی خەڵک و کۆمەڵگا. هەروەها پێویستە دەزگا تەندروستییەکان ڕۆڵێکی گەورە ببینن لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری لەسەر چۆنیەتی ئامادەکردن و هەڵگرتنی خواردن بەشێوەیەکی تەندروست.

دەکرێت دەزگا تەندروستییەکان سوود لە تەلەفزیون و ڕادیۆ و ئەنتەرنێت وەرگرن بۆ بڵاوکردنەوەی پەیام و ئامۆژگارییەکانیان بۆ هاوڵاتیان و کۆمەڵگە بە گشتی. لە ڕاستیدا دەکرێت بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بقۆزرێتەوە بۆ چەسپاندنی پابەندبوون بە پرنسیپە تەندروستییەکان و هاندانی خەڵک بۆ ڕێزگرتن لەو پرنسیپانە. هەروەها دەکرێت پەیامەکانی پاک و خاوێنی و پابەندبوون بە بنەما سەرەکییەکانی تەندروستیی لە

کاتی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە ڕێی مامۆستایانی ئایینی و مامۆستای قوتابخانەکان و پێشڕەوە کۆمەڵایەتی و سەرکردە سیاسی و ڕۆشنبیرە دیارەکانەوە بڵاوبکرێتەوە و سوود لە قورسایی ئەو کەسانە وەربگیرێت بۆ کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکە و هاندانی هاوڵاتیان بۆ پابەندبوون بە پەیامە تەندروستییەکان.

لەگەڵ ئەو میکانیزم و هەنگاوانەدا، زۆر گرنگە کە وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا تەندروستییەکانی تر کۆمەڵێک ئاگادارکەرەوە و ووریاکەرەوەیان دانابێت کە بە خێرایی زەنگی مەترسی لێبدەن لە کاتی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا. وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد زۆر گرنگە کە بە چاوی گومانەوە لە هەموو نەخۆشێکی سکچوونی توند بڕوانین بە تایبەتی ئەگەر هاتوو ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان لە یەک کاتدا تووشی سکچوون ببن یا خود سکچونەکە لە وەرز و شوێنێکدا ڕوویدات کە پێشتر کۆلێرای تێیدا بڵاوبووەتەوە. هاوکات دەکرێت دەزگا تەندروستییەکان سوود لە شێوازە خێراکانی تاقیکردنەوە و پشکنین وەرگرن بۆ ئاگاداربوون لە ئەگەری بڵاوبوونەوەی کۆلێرا.

دەبێت ئەوەش بگوترێت کە چارەسەرکردنی هەڕەمەکیانەی ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان بە ئەنتیبایۆتیک کە گومانی تووشبوون بە کۆلێرایان لێ دەکرێت، هیچ سوودێکی نیە کە لە ڕووی زانیستیەوە سەلمێندرابیت. بە پێچەوانەوە دەشێت چارەسەری هەڕەمەکیانە بەو جۆرە لە دەرمان ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی مەترسی دروستبوونی بەرگەری لە لایەن بەکتیریاکەوە (چی بەکتیریای کۆلێرا، یا بەکتیریاکانی تریش) بەرانبەر بەو دەرمانانەی کە هەڕەمەکییانە بەکاردەهێنێرن. هاوکات، چارەسەرکردنی هەڕەمەکیانە لەڕێی بەکارهێنانی ئەنتیبایۆتیکەوە ڕەنگە ببێتە هۆی دروستبوونی هەستێکی درۆزنانەی کۆتای هاتنی پەتاکە لە کاتێکدا کە ڕەنگە

دەرمانەکە کاریگەری نەبێت لەسەر بەکتیریاکە و لە ئەنجامدا نەخۆشەکە باجەکەی بدات و دەشێت ڕووبەڕووی مەترسیی مردنیش ببێتەوە.

## کۆنترۆڵکردن

لە نێو ئەو کەسانەی کە نیشانەکانی کۆلێرایان تێیدا دەردەکەوێت، لە نزیکەی ٨٠٪یاندا، نیشانەکان بە شێوازێکی سووک دەردەکەون و مەترسیەکی ئەوتۆ لەسەر ژیانی نەخۆشەکە دروستناکەن. نزیکەی ١٠-٢٠٪ ئەو نەخۆشانەی کە تووشی کۆلێرا دەبن کۆمەڵێک نیشانەی توندیان تێیدا دەردکەوێت کە دەبنە هۆی وشکبوونەوە و لەدەستدانی ڕێژەیەکی گەورەی شلەمەنی لەش. هەر کە دەزگا تەندروستییەکان بە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکەیان زانی، دەبێت ئامانجی یەکەمیان ئەوە بێت کە ڕێژەی مردن بەهۆی کۆلێراوە کەمبکەنەوە و هەوڵی ئەوە بدەن کە ڕێژەکە لە خوار ١٪ەوە بێت. واتە گرنگە کە دەزگا تەندروستییەکان نەهێڵن لە نەخۆشێک زیاتر بۆ هەر ١٠٠ کەسێک، کە تووشی کۆلێرا دەبێت، بمرێت. دیارە گرنگە کە هیچ نەخۆشێک نەمرێت بە کۆلێرا، بەڵام ئەگەر هاتوو زیاتر لە ١٪ی نەخۆشەکان مردن، ئەوە دەبێت دەزگا تەندروستییەکان ئەو پرسیارە لە خۆیان بکەن کە ئاخۆ چی شتێک هەیە بیکەن بۆ ئەوەی ڕیگری لە مردنی خەڵکی زیاتر بگرن وەیا بپرسن چی شتێکیان نەکردووە کە دەشێت بیکەن بۆ ڕزگاکردنی ژیانی نەخۆشەکان لە مردن.؟

بۆ ئەوەی ئەو کارانەی سەرەوە بکرێت، یەکێک لە گرنگترین هەنگاوەکان بریتیە لە دروستکردن و پەرەپێدانی هەماهەنگی لە نێوان هەموو ئەو لایەنانەی کە بەرپرسن لە پاراستنی پاکوخاوێنی و بەرپرسن لە دابینکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ هاوڵاتیان. سەرەکیترین ئەو ئامارازو

میکانیزمانەی کە دەکرێت بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆلێرا جێبەجێبکرێن بریتین لەمانەی خوارەوە:

• چارەسەرکردنی ئەو کەسانەی کە تووشی کۆلێرا بوون بە شێوەیەکی ورد و جیدیی لە سەنتەری تایبەت بە چارەسەرکردنی کۆلێرا کە لە لایەن دەزگا تەندروستییەکانەوە بۆ ئەو مەبەستە دابیندەکرێت.

• دابینکردنی ڕاهێنان بۆ کارمەندانی تەندروستیی و ئەو پزیشکانەی کە چارەسەری نەخۆشەکان دەکەن لەسەر پرنسیپ و بنەماکانی چارەسەرکردنی کۆلێرا و چۆنیەتی ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بە تایبەتی لە نێو نەخۆشخانە و دەزگا تەندروستییەکان خۆیاندا.

• دابینکردنی پەیداویستیەکانی چارەسەرکردنی کۆلێرا بە شێوەیەکی ئەتۆ کە بەشی ئەو ژمارە زۆرە بکات لە هاوڵاتیان کە زۆربەی جاران تووشی کۆلێرا دەبن و بە لێشاو ڕوو لە دەزگا تەندروستییەکان دەکەن.

• دابینکردنی ئاوی پاکی خواردنەوە و چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لە بەردەم هاوڵاتیاندایە بۆ گەیشتن بە ئاوی پاکی خواردنەوە و گرنگی دان بە لەناوبردنی پاشماوە مرۆییەکان (پیسایی) و کۆنترۆڵکردنی ئەو بوونەوەرانەی کە ڕۆڵیان هەیە لە گواستنەوەی بەکتیریای کۆلێرا وەکو مێش و مەگەس.

• گرنگیدان بە پاکوخاوێنی بە تایبەتی لە شوێنە گشتیەکانی وەکو چێشتخانەکانی ناوەوە و دەرەوەی شار و گرنگیدان بە ئاوی خواردنەوەی قوتابخانە و نەخۆشخانەکان.

• باشترکردنی پەیوەندی و گەیاندنی پەیامی هۆشیارکردنەوە بۆ هاوڵاتیان بە گشتی و ئەو گروپە کۆمەڵایەتیانەی کە ئەم تۆێژینەوەیە دەریخستوون وەکو گروپێک کە ئەگەری زۆرترین تووشبوونیان هەیە بە کۆلێرا.

## چارەسەر:

پێش ئەوەی باسی شێوازەکانی چارەسەری کۆلێرا بکەین، دەبێت ئەوە بووترێت کە پێویستە وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا تەندروستییەکان پلانی ئەوەیان هەبێت کە لە کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکەدا، شوێنی تایبەتی چارەسەرکردنی کۆلێرا لەو گەڕەک و شوێنانەدا دابمەزرێنن کە نەخۆشییەکەیان تێیدا بڵاوبووەتەوە. دابینکردنی ئەو شوێنانە سوودێکی گەورەی هەیە لە گەیاندنی خزمەتی تەندروستیی و پزیشکیی بەو کەسانەی کە پێویستییان پێیەتی بە شێوەیەکی خێرا و کاریگەر و ڕەنگە ببێتە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی چەندان هاوڵاتی کە بەهۆی قورسی نیشانەکانیانەوە دەشێت نەتوانن بە نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییەکان ڕابگەن.

چارەسەری کاریگەری نەخۆشیی کۆلێرا بریتیە لە گەڕاندنەوەی ئەو ئاو و شلەمەنییەی کە نەخۆشەکە بەهۆی سکچوون و هەندێک جار ڕشانەوەوە لەدەستی دەدات. گەڕاندنەوەی ئاو و شلەمەنی بۆ لەشی نەخۆشەکە دەشێت لەڕێی دەمەوە بێت (ئەگەر هاتوو نەخۆشکە ڕشانەوەی نەبێت) یا خود لەڕێی دەمارەوە (ئەگەر هاتوو نەخۆشەکە ڕشانەوەی هەبوو یا سکچوونێکی توندی ئەوتۆی هەبوو کە پێویستی بە دابینکردنی خێرای ئاو و شلەمەنی هەبوو). لەو نەخۆشانەی کە بەشێوەیەکی توند تووشی نەخۆشیەکە دەبن، دەکرێت ئەنتیبایۆتیک بەکاربهێنرێت. دەرمان و ئەنتیبایۆتیک سوودی هەیە ئەگەر هاتوو نەخۆشکە تووشی سکچوونێکی توند هاتبێت بۆ کورتکردنەوەی ماوەی سکچوونەکە و کەمکردنەوەی فڕێدانی بەکتیریاکە بۆ دەرەوەی لەشی نەخۆشەکە (و لە ئەنجامیشدا کەمکردنەوەی ئەگەری تووشبوونی خەڵکی تر بە بەکتیریاکە). هەروەها

دەرمان رۆڵی هەیە لە کەمکردنەوەی قەبارەی ئەو ئاو و شلەمەنییەی کە نەخۆشەکە پێویستی پێدەبێت.

توێژینەوەکان دەریانخستووە کە لەو منداڵانەی تەمەنیان لە خوار ٥ ساڵەوەیە و تووشی کۆلێرا دەبن، ماددەی زینک گرنگیەکی گەورەی هەیە لە کورتکردنەوەی ماوەی سکچوون و کەمکردنەوەی توندی سکچوونەکە. کاریگەری ئەو ماددەیە بە جۆرێکە کە لە گەڵ هەر جارێکی سکچووندا، ماوەی ئەو سکچوونەکە کورتتردەبێتەوە لە جارەکانی تر و باری تەندروستیی نەخۆشەکە بەرەو باشتر دەڕوات. بە گوێرەی ئەوە توێژینەوانە، دەبێت هەر منداڵێک کە تەمەنی لە خوار ٦ مانگەوەیە ماددەی زینکی بە بڕی ١٠ مغ ڕۆژانە پێبدرێت بۆ ماوەی ٢ هەفتە. هەروەها بۆ ئەو منداڵەی کە تەمەنی لە ٦ مانگ بۆ ١٢ ساڵە، زینک بە بڕی ٢٠ مغ دەبێت بۆ ماوەی ٢ هەفتەی پێبدرێت (WHO ,c2013)

## کوتان:

دوو جۆر کوتان لە دژی کۆلێرا بوونی هەیە. جۆرێکیان لە ڕێی دەمارەوەیە و ئەوی تریان لە ڕێی دەمەوە. لە حاڵی حازردا کوتان لە ڕێی دەمەوە بۆ نەخۆشی کۆلێرا لە جیهاندا بەکاردەهێنرێت و کوتان لە ڕێی دەمارەوە وەستێنراوە یا بەلایکەمەوە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئامۆژگاری ئەوە دەکات کە کوتان دژی کۆلێرا لەڕێی دەمارەوە بەکارنەهێنرێت. ژمارەیەکی کەمی ئەو لوقاحەی لەڕێی دەمەوە دەدریت لە بازەڕاکەندا دەستدەکەوێت. ئەم کوتانە بۆ ئەوانەی تەمەنیان لە سەروو دوو ساڵەوەیە دەشێت و هیچ کاریگەریەکی نێگەتیڤی ئەوتۆ لەسەر ئەو کەسانە دروستناکات کە وەریدەگرن. کوتانەکە بە دوو ‹جرعە› دەدرێتە نەخۆش کە ١٠-١٥ ڕۆژ دەبێت لە نێوان جرعەی یەکەم و جرعەی

دووەمـدا هەبێـت. کوتانەکـە لـە بـڕی ١٥٠ سیسـی ئـاوی مغذیـدا دەدرێـت. ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهانیـی بەمدواییانـە کۆمەڵێـک ڕێنمایـی دەرکـرد بـۆ چۆنیەتـی بەکارهێنانـی کوتانەکـە لـەو شـوێن و کاتانـەی کـە ڕووداوی لەنـاکاو و قەیرانـە مرۆییەکانـدا دەبنـە هـۆی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا. ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهانیـی ئەمانـەی خـوارەوە لەسـەر بەکارهێنانـی کوتـان دژی کۆلێـرا دەڵێـت:

•کوتـان دژی کۆلێـرا دەبێـت هـەردەم وەکـو ئامرازێکـی یاریـدەدەر بەکاربهێنرێـت لـە پـاڵ بڵاوکردنـەوەی هۆشـیاری لەسـەر پاکوخاوێنـی و پاراسـتن و پەرەپێدانـی بنەمـا تەندروسـتییەکان و دۆزینـەوەی هۆکارەکانـی بڵاوبوونەوەی نەخۆشـییەکە لە پیسـبوونی ئاوی خواردنەوە و چارەسـەرکردنی ئـەو هۆکارانـە. واتـە نابێـت کۆتـان دژی کۆلێـرا وەکـو تاکـە ئامـراز بـۆ کۆنترۆڵکردنـی نەخۆشـییەکە بەکاربهێنرێـت و ئامـراز و میکانیزمەکانـی تـر پشـتگوێبخرێن.

•ئـەو جـۆرە لوقاحـەی کـە حاڵـی حـازر لـە بەردەسـتدایە نابێـت دوای بڵابوونـەوەی کۆلێـرا بەکاربهێنرێـت بەڵکـو دەبێـت وەکـو ئەمرازێکـی خۆپاراسـتن بەکاربهێنرێـت لـە باتـی ئـەوەی وەکـو ئامرازێکـی کۆنتـرۆڵ پشـتی پێببەسـترێت. هەروەهـا کوتانـی دژی کۆلێـرا دەبێـت بـە دوو جرعـە بەکاربهێنرێـت کـە نێوانـی هـەر یەکێکیـان ١٠-١٥ ڕۆژە وەکـو لـە سـەرەوە ئامـاژەمـان پێـدا. بۆیـە لـەو مـاوە زۆرەدا ڕەنگـە نەخۆشـەکە چاکببێتـەوە و چیتـر پێویسـتی بـە کوتـان نەبێـت یاخـود نەخۆشـییەکی ئەوەنـدە تونـد بێـت کـە ڕەنگـە گیـان لـە دەسـتبدات و کوتـان هیـچ سـوودێکی ئەوتـۆی نەبێـت. هەروەهـا کوتـان دژی کۆلێـرا کاتێکـی زۆری دەوێـت تـا کاری خـۆی دەکات. بۆیـە ناکرێـت چاوەڕوانـی ئـەوە بکرێـت تـا لوقاحەکـە کاری خـۆی دەکات لـە کاتێکـدا کـە ئـەو ماوەیـەی لـە چاوەڕوانیـدا بەفیرۆدەدرێـت کارێکـی زۆر

دەکاتە سەر ئامادەباشی نەخۆشەکە بۆ سوودوەرگرتن لە چارەسەر و ئامرازەکانی تری خۆپاراستن. هاوکات کڕین و دابەشکردن و بەکارهێنانی کوتان دژی کۆلێرا پارە و داهاتێکی زۆری دەوێت و لە زۆر وڵاتدا ئەو خەرجییە پێویستە بۆ کڕین و دابەشکردنی کوتانەکە لە بەردەستدا نیە.

## سەفەر و گەشت:

لە ساڵی ١٩٧٣دا، ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی گۆڕانکارییەکی هێنایە کایەوە لە سیاسەتەکانی خۆی لەمەڕ مامەڵەکردن لە گەڵ گەشتی ئەو کەسانەی کە گومانی تووشبوون بە کۆلێرایان لێدەکرێت. پێش ساڵی ١٩٧٣، ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئامۆژگاری وڵاتانی جیهانی دەکرد کە بۆ هەر کەسێک کە سەردانی وڵاتەکانیان دەکات، داوای بەڵگەی کوتان دژی کۆلێرا بکەن. بەڵام لەو ساڵەدا، ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی لەو ئامۆژگارییە پاشگەزبووەوە و لە حاڵی حازردا هیچ وڵاتێکی دنیا نیە کە بە شێوەیەکی ئاگتیڤ داوای بەڵگە لە گەشتیاران بکات لەسەر کوتان دژی کۆلێرا.

هاوکات، ئەزموونی ڕابووردوو لە وڵاتاندا دەریخستووە کە وەستاندنی گەشت و جوڵەی گەشتیاران لە کاتی بڵاوبوونەوەی کۆلێرادا، کارێکی ئەوتۆ ناکاتە سەر وەستاندنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە و کۆنترۆڵکردنی. هەروەها ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی هیچ زانیاری و بەڵگەیەکی ئەوتۆی لەلا نیە کە بیسەلمێنێت کە وەستاندنی هاتنی خواردن لەو وڵاتانەی کە کۆلێرا تێیاندا بڵاوبووەتەوە هیچ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر کەمکردنەوە یا نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە. ئەو بۆنە کەمانەی کە کۆلێرا لەڕێگای خواردنی هاوردەوە گواستراوەتەوە بەهۆی ئەو جۆرە خواردنانەوە بووە کە گەشتیارەکان لەگەڵ خۆیاندا هێناوێنە بۆ وڵاتەکە

نـەوەک هێنانـی برێکـی زۆری خواردنـی هـاوردە لـە وڵاتێکـی دیاریکـراوەوە.
بۆیـە هیـچ بەڵگەیـەک نیـە لەسـەر ئـەوەی کـە قەدەغەکردنـی هاوردەکردنـی
خـواردن لـەو وڵاتانـەی کـە کۆلێرایـان تێیـدا بڵاوبووەتـەوە کاریگـەری هەبێـت
لەسـەر خۆپاراسـتن لـە نەخۆشـیەکە. بـەڵام دەبێـت ئـەوە بووترێـت کـە
هەمـوو جۆرێکـی خـواردن کـە تاکەکەسـەکان لەگـەڵ خۆیانـدا دەهێننـە
وڵاتـەوە دەبێت قەدەغەبکرێـت چونکـە ئەگـەری هێنانـی نەخۆشیەکەی هەیـە.

## ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی لەسەر کۆلێرا لە کوردستاندا:

سـەبارەت بـە بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە کوردسـتان بـە گشـتی و
پارێـزگای سلێمانی بـە تایبەتـی، ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهانیـی هـەر لـە
سـەرەتای بڵاوبوونـەوەی پەتاکـەوە، هۆشـداری لەسـەر ئـەوە دا کـە دەزگا
تەندروسـتییەکانی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان لـە ئاسـتێکی ئەوتـۆدا نیـن
بـۆ ڕێگەگرتـن لـە بڵاوبوونـەوەی پەتاکـە. بـۆ نموونـە ڕێکخـراوی تەندروسـتیی
جیهانیـی لـە ڕاپۆرتێکـی خۆیـدا کـە بـە تایبەتـی لەسـەر بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا
لـە هـەردوو پارێـزگای سلێمانی و کەرکوکدا، ئامـاژە بـەوە دەکات کـە توانـای
دەزگا تەندروسـتییەکان لـە چاودێریکردنـی ئـاوی خواردنـەوە بـاش نیـە و
پێویسـتی بـە گرنگیدانـی زیاتـر و بەرەوپێشـەوەبردن هەیـە (WHO ,2012)

لـە هەمـان ڕاپۆرتـدا، ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهانیـی هۆشـداری دەدات
کـە دەزگا تەندروسـتییەکانی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان شکسـتیان
هێنـاوە لـەوەی کۆمەڵێـک سـتانداردی جیهانیـی بپێکـن بـۆ ڕێگەگرتـن لـە
بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا. یەکێـک لـەو سـتانداردە جیهانییـە گرنگانـەی کـە
بەپێـی ڕاپۆرتەکـەی ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهانیـی پشـتگوێخراوە بریتیـە
لـە ئەنجامدانـی تاقیکردنـەوەی پیسـایی بـۆ ١٠٪ی هەمـوو ئـەو کەسـانەی
کـە تووشـی سـکچوون دەبـن بـۆ ئـەوەی دەزگا تەندروسـتییەکان دڵنیابـن

لە بڵاونەبوونەوەی کۆلێرا. ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بیانووی ئەوە دەهێننەوە بۆ شکستهێنانیان لە ئەنجامدانی ئەو تاقیکردنەوانە بۆ ژمارەی زۆری ئەو کەسانەی کە تووشی سکچوون بوون. دیارە ئەوەش بە پێی هیچ پێوەرێک بیانوویەکی بەهێز نیە و جارێکی تر بەلگەیە لەسەر شکستی دەزگا تەندروستییەکان بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەو هەنگاوانەی کە دەکرێت کاریگەربن لە ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی پەتاکە.

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی بەردەوام دەبێت لە سەرزەنشتکردنی دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی تەندروستیی و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو دەزگایانە شکستیان هێناوە لە کێشانەی نەخشەیەکی جیوگرافی و کاتیی بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە بۆ ئەوەی یارمەتی هەموو لایەک بدات بۆ کۆنترۆڵکردنی. بۆ نموونە وەزارەتی تەندروستیی و دەزگاکانی نەیانتوانیوە بە زوویی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە و ئەو شوێنانە دەستنیشانبکەن کە پەتاکەی تێیدا بڵاوبووەتەوە. کێشانی نەخشەیەک بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە و ئەو شوێنانەی کە تێیدا بڵاودەبێتەوە گرنگیەکی گەورەی هەیە بۆ پلاندانان بۆ چارەسەرکردنی پەتاکە و کۆتایی هێنان پێ و کۆنترۆڵکردنی. بۆیە دیسان وەزارەتی تەندروستیی و دەزگاکانی شکستیان هێنا لە ئەنجامدانی یەکێک لە گرنگترین ئەرکەکانی خۆیان. ئەم شکستە نەک تەنها بووە هۆی درەنگکەوتنی کۆنترۆڵکردنی پەتاکە بەڵکو دەبێتە هۆی دووبارە بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیە لە هەمان ئەو شوێنانەی کە پێشتر تێیاندا بڵاوبووەتەوە.

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی بەشێوەیەکی تایبەت جەخت لەسەر پیسبوونی ئەو خواردنانەی کە لە خواردنگەکانی دووکان دەخورێت وەکو

سەرچاوەیەکی سەرەکی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا دەکات. لەڕاستیدا بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە لە دووکان و هەروەها بڵاوبوونەوەی بۆ سلێمانی و کەرکووک و چەمچەماڵ، بەڵگەیەکی بەهێزن لەسەر پیسبوونی سەرچاوەکانی ئاوی دووکان وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد. هەروەها تێکەڵبوونی ئاوی خواردنەوە لە دووکان لەگەڵ ئاوەڕووی شارۆچکەکە، هۆکارێکی گرنگی تری بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکەیە. وەستانی زۆرێک لەو گەشتیارانەی کە سەردانی کوردستان بە گشتی و شاری سلێمانی بە تایبەتی دەکەن لە هاوینەهەواری دووکان، ڕەنگە یەکێکی تر بێت لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا. ئەو گەشتیارانەی کە هەڵگری بەکتیریای کۆلێران و لە دووکان دادەبەزن و ئاودەستەکانی ئەو هاوینەهەوارە بەکاردەهێنن، بەکتیریاکە دەگوازنەوە. بەهۆی ئەوەی کە ئاوەڕۆکانی هاوینەهەوارەکە لە گەڵ ئاوی خواردنەوەی شاری سلێمانی و شار و شارۆچکەکانی دەوروبەردا تێکەڵدەبێت، زۆر بە ئاسانی کۆلێرا لەو ناوچەیەدا بڵاودەبێتەوە.

هەروەها ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی لە ڕاپۆرتەکەی سەرەوەیدا جەخت لەسەر بارودۆخی خراپی ئاوی خواردنەوەی ماڵان دەکات. لەو ڕاپۆرتەدا، ڕێکخراوی تەندروستیی ئاماژە بەوە دەکات کە بەشێک لە ئاوی خواردنەوەی ماڵان لە پارێزگای سلێمانی تێکەڵی ئاوەڕۆ بووە. هەروەها ڕێکخراوەکە ئاگاهی لەسەر ئەوە دەدات کە بەشێک لە بۆڕیەکانی ئاوی پارێزگاکە کۆن بوون و ئاویان لێدەڕوات و تێکەڵ بە قوڕ و لیتاو دەبن. بۆیە ئەو ڕێکخراوە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە لەسەر لایەنە پەیوەندیدارەکان کە بارودۆخی ئەو بۆریانە چارەسەربکەن و سنوورێک بۆ تێکەڵبوونی ئاوی خواردنەوەی ماڵان لە گەڵ ئاوەڕۆکان و پیسیی و قوڕ و لیتەدا دابنێن. دیارە ئەمەش بۆ خۆی یەکێکە لە هۆکارەکانی گۆڕانی ڕەنگی ئاوی خواردنەوەی ماڵان کە لە بەشەکانی سەرەوەدا ئاماژەمان پێدا. هەر لە پەیوەند بە ئاوی خواردنەوەی ماڵان،

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی دەسەڵاتدارانی وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا پەیوەندیدارەکانی تری حکومەت هاندەدات کە تاقیکردنەوەی خێرا بۆ ئاوی خواردنەوەی ماڵان بکەن ئەگەر هاتوو ڕەنگ و بۆن و تامی ئاوەکە گۆڕا. ئەو تاقیکردنەوە خێرایە، بە گوێرەی ڕێکخراوەکە ڕۆڵی دەبێت لە ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی هەرچی زیاتری پەتاکەیە.

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی، هۆکارێکی تری بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە کوردستاندا بۆ بەکارهێنانی ئەو سەهۆڵە دەگەڕێنێتەوە کە لە بازاڕەکاندا دەفرۆشرێت. ڕێکخراوەکە هۆشیاریدەدات لەسەر ئەوەی کە سەرچاوەی ئەو سەهۆڵە گومانی لەسەرە و دەبێت چاودێری بکرێت لەلایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانەوە. ئەو ڕێکخراوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پیسبوونی ئەو ئاوەی کە بۆ دروستکردنی سەهۆڵ بەکاردەهێنرێت دەشێت هۆکارێکی سەرەکی گواستنەوەی کۆلێرا بێت، بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا کە پەیداویستی بۆ ساردکردنەوەی ئاوی خواردنەوە لەڕێی بەکارهێنانی سەهۆڵەوە زیادەکات. هەروەها بچڕانی بەردەوامی وزەی کارەبا لە وەرزی هاویندا، دیسان پەیداویستی هاوڵاتیان بۆ بەکارهێنانی سەهۆڵ زیادەکات و بەو هۆیشەوە ئەگەرەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بەهۆی پیسبوونی ئەو ئاوەی کە بۆ خواردنەوە بەکاردەهێنرێت لە ناو ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیاندا زیاتر دەکات.

## وەزارەتی تەندروستیی:

وەکو لە بەشەکانی سەرەوەدا ئاماژەمان پێکرد، زۆر جار وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا پەیوەندیدارەکانی تر دوو جۆر گوتاریان سەبارەت بە کۆلێرا بەخشیووە. گوتارێکیان بۆ دەرەوە و ئەوی تریان بۆ ناوەوەی کوردستان. هەردوو گوتارەکە زۆر لە یەک جیاوازن. سەبارەت بە ناوخۆ،

وەزارەتـی تەندروسـتیی و حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان بـە گشـتی لـە هەوڵی ئـەوەدا بـوون کـە هاوڵاتیـان ئارامبکەنـەوە و لـەوە دڵنیایـان بکەنـەوە کـە پەتـای کۆلێـرا لـە ژێـر کۆنترۆڵدایـە و مەترسـیەکی ئەوتـۆ لـە سـەر ژیانیـان دروسـتناکات. لـە ڕاسـتیدا زۆر جـار حکومەتـی هەرێـم و وەزارەتی تەندروسـتیی ڕاسـتیەکانیان لـە خەڵـک شـاردووەتەوە و لـە پێنـاوی ئـەوەی کـە قسـەیان نەیەتـە سـەر و ڕەخنەیـان لـێ نەگیرێـت کۆمەڵێـک زانیاری هەسـتیاریان لەسـەر ژمـارەی کەسـە تووشـبووەکان و نەخۆشـەکان شـاردووەتەوە.

لـە بەرامبەریشـدا و بـۆ بەدەسـتهێنانی پـارە و بودجـە و یارمەتـی لـە ڕێکخـراوە خێرخـوازەکان و دەزگا نێودەوڵەتیـەکان، حکومەتـی هەرێـم و وەزارەتـی تەندروسـتیی هاواریـان لـێ هەسـتاوە و داوای یارمەتـی و فریاگوزاریـان لـەو ڕێکخـراو و دەزگایانـە کـردووە. نموونـەی ئـەوەش داواکاری حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتانە لـە یەکێتـی ئەوروپـا بـۆ ئـەوەی لـە کاتـی بڵاوبوونـەوەی پەتاکـەی سـاڵی ٢٠٠٧دا فریـای هەرێمـی کوردسـتان بکـەون و لەڕێـی ئەنـدام پەرلەمانێکـی یەکێتـی ئەورووپـاوە داوای یارمەتـی کـراوە (Parliament ,2007). ئـەم کاردانەوانـەی وەزارەتـی تەندروسـتیی و دەزگا پەیوەندیدارەکانـی تـر، نـەک تەنهـا ڕۆڵێکـی نەگەتیڤـی هەبـووە لـە کۆنترۆڵکردنـی کۆلێـرا بەڵکـو ڕۆڵیشـی هەبـووە لـەوەی کـە سـاڵ دوای سـاڵ دیسـانەوە هاوڵاتیانـی هەرێـم تووشـی ئـەم دەردە کوشـندەیە ببـن. دەردێـک کـە تەنهـا لـە وڵاتـە دواکەوتووەکانـدا بڵاودەبێتـەوە و تەنهـا لـەو شـوێنانە بڵاودەبێتەوە کە گەندەڵی و ناکارامیی و پشتگوێخسـتن خەسـڵەتی سـەرەکی حکومەتەکانـی ئـەو وڵاتانـەن. لـە کوردستانیشـدا بـە هەمـان شـێوەی ئـەو وڵاتانـەی سـەرەوە، گەندەڵـی و پشتگوێخسـتن و ناکارامەیـی لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانـی حکومـەت و دەزگا پەیوەندیـدارەکان وای کـردووە کـە کۆلێـرا بڵاوببێتـەوە. بـۆ نموونـە بەپێـی یەکێـک لـە ڕاپۆرتەکانـی چاودێـری دارایـی سـلێمانی، پارەیەکـی زۆر بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی کۆلێـرا تەرخانکـراوە بـەڵام

بڕێکی زۆری ئەو پارەیە یا دیارنەماوە یاخود بۆشتی تر خەرجکراوە . لە هەمان ڕاپۆرتدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە لە لایەن وەزارەتی هەرێم بۆ کاروباری داراییەوە بڕی یەک ملیار دینار بۆ پارێزگای سلێمانی دابیکراوە بۆ چارەسەرکردن و ڕووبەڕووبوونەوەی پەتای کۆلێرا لە شارەکەدا. بۆ نموونە بڕی ٢٦٠ ملێون دینار لە بودجەکە تێکەڵی بودجەی وشکەساڵی کراوە و بۆ نەخۆشییەکە خەرج نەکراوە (Kurdistan New,2011)

وەزارەتی تەندروستیی لە کاتی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە کوردستاندا کۆمەڵێک ڕێنمایی دەرکرد بۆ کۆنترۆڵکردنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە . لە خوارەوە ئەو ڕێنماییانە وەکو خۆیان دەخەینە ڕوو (KRG ,2012):

**هاووڵاتی خۆشەویست... بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلێرا، دەستەکانت بەئاو و سابون جوان بشۆ پێش ئامادەکردنی خواردن، پێش نان خواردن وە دوای دەرچوون لە ئاودەست.**

**هاووڵاتی خۆشەویست... بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلێرا، خواردن بەباشی بکوڵێنە**

**خواردنی هەڵگیراو جوان گەرم بکەوە پێش خواردنی.**

**هاووڵاتی خۆشەویست... بۆخۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلێرا، ئاوی پاک (دوای کوڵاندن و ساردبونەوەی) بەکاربهێنە بۆ خواردنەوە، بۆ چێشت لێنان و شۆردنەوەی سەوزە و میوە**

**هاووڵاتی خۆشەویست... بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلێرا، ئەگەر**

دڵنیانەبوویت لە پاکی ئاو ئەوا ئاوەکە بکوڵێنە بۆ ماوەی (٥) خولەک یان کلوری تێبکە بۆ پاککردنەوەی .

هاووڵاتی خۆشەویست... بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلیرا، دوور کەوە لە خواردنی خواردن و خواردنەوەی سەردانەپۆشراو یان داندراو لە سەر شۆستەکان

هاووڵاتی خۆشەویست... بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلیرا، لە چێشتخانەکان سەوزەمەخۆ و ماستاوی قوتونەکراو مەخۆوە، ئاوی بوتڵ بەکاربهێنە.

هاووڵاتی خۆشەویست لەکاتی توشبوونت بە سکچوون بەزووترین کات سەردانی پزیشک بکە هاووڵاتیخۆشەویست بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلیرا، قاڵبی بەفر بەکارمەهێنە بۆساردکردنەوە.

هاووڵاتی خۆشەویست بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلیرا، دەستەکانت جوان بە ئاو و سابوون بشۆ،

ئاوی کوڵاو دوای ساردبوونەوە بەکاربهێنە بۆ خواردنەوە و چێشت لێنان، خواردن بە باشی بکولێنە پێش خواردنی

هاووڵاتی خۆشەویست مەلەکردن لەمەلەوانگە گشتیەکان مەترسی تووشبوونی هەیە بەنەخۆشی کۆلیرا، دوورکەوە لێی.

ئەگەر بە وردی لەم ڕێنمایانە بڕوانین دەبینین خەسڵەتێکی گشتی هەموویان کۆدەکاتەوە. ئەو خەسڵەتەش بریتیە لەوەی زۆربەی هەرە زۆری بەرپرسیارێتیەکانی خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلێرا دەخاتە سەر شانی هاوڵاتی خۆی. ئەم خەسڵەتە تەنها دەکرێت بەوە لێکبدرێتەوە کە وەزارەتی تەندروستیی لە ئەرکی سەرەکی خۆی دەشارێتەوە و ئەو ئەرکە پشتگوێدەخات. ئەرکی سەرەکی وەزارەتی تەندروستیی تەنها ئەوە نیە کە ڕێنمایی هاوڵاتیان بکات، بەڵکو لەسەر وەزارەتی تەندروستییە کە هەماهەنگی لەگەڵ هەموو لایەنەکانی تر بکات بۆ ئەوەی هەموو ئەو مەرجە تەندروستییانە فەراهەمبکرێن کە گەرەنتی ساغی و سەلامەتی هاوڵاتیان دەکات و دڵنیایان دەکاتەوە لە نەخۆشکەوتن. بۆ نموونە لەسەر وەزارەتی تەندروستییە کە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتەکانی شارەوانی و دەزگا تایبەتەکانی ئاو بکات بۆ ئەوەی لەوە دڵنیا بێت کە ئاوی ماڵان شیاوی خواردنەوەیە و دەشێت بۆ بەکارهێنانی مرۆیی. ئەگەر نا ئەوە خیانەتێکی گەورەی وەزارەتی تەندروستییە ئەگەر ئەو دڵنیا بێت لەوەی کە ئاوی ماڵان شیاوی خواردنەوە نیە و داوا لە هاوڵاتیان بکات کە وەکو لە ڕێنماییەکە هاتووە (ئەگەر دڵنیا نەبوون ئەوا دەبیت ئاوەکە بکوڵێنن).

یاسای ژمارە (١٥)ی ساڵی ٢٠٠٧ی وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە لە پەرلەمانی کوردستانەوە دەرچووە ئەرکەرکەکانی وەزارەتی تەندروستیی بە ڕوونی دیاریدەکات (Kurdistan Parlia- 2007 ment). ئەو یاساییە لە برگەی یەکەمی ماددەی دووەمدا سەبارەت بە ئەرکەکانی وەزارەتی تەندروستیی ئەمەی خوارەوە دەڵێت: «ئامادەکردنی ئەو پەیداویستیانەی کە مافی شیاوی تەندروستیی تەواو بۆ هاوڵاتیان دەستەبەر دەکات لە لایەن جەستەیی و ئەقڵی و دەروونییەوە لەگەڵ

گرنگی پێدانیان». پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئاخۆ ئەگەر دابینکردنی ئاوی پاکی خواردنەوە یەکێک نەبێت لە ئەرکەکانی وەزارەتی تەندروستیی بۆ دابنیکردنی مافی شیاوی تەندروستیی، دەبێت چی شتێکی تر ئەرکی وەزارەتی تەندروستیی بێت؟

دەبێت ئەوە بگوترێت کە وەزارەتی تەندروستیی لەسەر زاری زیاد لە بەرپرسێکی خۆی، ئەوەی ڕاگەیاندووە کە هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرا لە کوردستاندا بۆ پیسبوونی ئاوی خواردنەوەی ماڵان دەگەڕێتەوە (Kurdsat ,b2012). بەڵام وەزارەتی تەندروستیی لەوەدا شکستی هێنا کە بتوانێت لایەنە پەیوەندیدارەکان لەو ڕاستیە ئاگاداربکاتەوە کە ئاوی خواردنەوەی ماڵان بە تایبەتی لە شاری سلیمانی پیسە و بۆ خواردنەوە شیاو نیە. زۆرێک لە لێدوانەکانی بەرپرسەکانی دەزگاکانی ئاو و شارەوانەی بە پێچەوانەوەی وەزارەتی تەندروستییەوە دڵنیاییان لەوە دەدا کە سەرچاوەکانی ئاو هیچ کێشەیەکیان نیە و تاقیکردنەوەکانەی ئەوان ئەوەیان پیشانداوە کە ئاوی ماڵان شیاوی خواردنەوەیە. بۆ نموونە بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی بەڕێوەبەرایەتی ئاوی سلێمانی لە لێدوانێکی ڕۆژنامەوانیدا دەڵێت کە ئەوان گومانیان نییە لەوەی ئاوی سلێمانی ئاوێکی پاکە و «هاوڵاتیانی ئەو شارە جگە لە ئاوی دەریاچەی دوکان، ئاوی بیریش بەکاردەهێنن، دوور نیە ئاوی بیر ماڵان پیس بێت و سەرچاوەی نەخۆشییەکە بێت (Niqash . ,2012).

هەرچەندە ژمارەی تووشبووان بە نەخۆشییەک و ئەو گەڕەکانەی کە تێیدا دەژین بە توندی دژی ئەو قسانەی بەرپرسی ڕاگەیاندنی بەڕێوەبەرایەتی ئاوی سلێمانییە، بەڵام وەزارەتی تەندروستیی شکستی هێناوە لەوەی کە ئەوان قەناعەت پێبکات کە کێشەکە تەنها بیری ماڵان نیە بەڵکو کێشەکە لەوە گەورەترە. تەنانەت وەزارەتی تەندروستیی

شکستی لەوەش هێناوە کە گۆڕانکارییەکی زەقی وەکو گۆڕانی ڕەنگ و تام و بۆنی ئاوی مالآن بەکاربهێنێت بۆ سەلماندنی ئەو گریمانەیەی کە ئاوی مالآن شیاوی خواردنەوە نیە و هۆکارە بۆ بلآوبوونەوەی نەخۆشیی.

لە کاتێکدا کە وەزارەتی تەندروستیی تەنها هاولآتیانی کردبووە ئامانج بۆ ڕێنماییەکانی خۆی و فاکتەرە گەورە و گشتگیرەکانی تری پشتگوێخستبوو، دەزگاکانی تایبەت بە ئاو بە دوای هۆکاری بێ بنەما و نازانستی دەگەڕان بۆ ئەوەی ئەستۆی خۆیان لە بەرپرسیارێتی سووکبکەن و لەو بەرپرسیارێتیە هەلبێن. وەکو لە بەشەکانی سەرەوەدا ئاماژەمان پێکرد و بەداتا و ژمارەوە ئەوەمان سەلماند کە ئاوی خواردنەوەی مالآن نەک تەنها ڕەنگ و تام و بۆنی گۆڕابوو، بەلکو لەڕووی پیکهاتەی کیمیاویشەوە شیوای خواردنەوە نیە، بەلآم دەزگاکانی تایبەت بە ئاو لە پشتگوێخستنی ئەو ڕاستیانە بەردەوام بوون و ڕاستیەکانیان بە کۆمەلێک ڕێنمایی بێ بنەما و نازانستی شیواند. بۆ نموونە بەڕێوەبەرایەتی ئاوی سلێمانی لە کۆمەلێک ڕێنماییدا دەلێت کە ئاوی بیری مالآن شیاوی خواردنەوە نیە و هۆکاری بلآوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرایە. ئەمە لە کاتێکدایە کە گرافی ژمارە ٩ زۆر بە ڕوونی ئەوە پیشاندەدات کەوا ٩٤٪ ئەو کەسانەی کە تووشی کۆلێرا بوونی لە ئاوی مالآنیان خواردووەتەوە.

سەربارەی ئەم دۆزینەوانەی کە تایبەتە بە کوردستان و پیشانی دەدات کە ئاوی خواردنەوەی مالآن سەرچاوەی سەرەکی بلآوبوونەوەی کۆلێرایە لە کوردستاندا، لە شوێنی تری جیهانییشدا توێژینەوەی هاوشێوە کراوە کە زۆر بە کەمی یا بە هیچ شێوەیەک هۆکاری بلآوبوونەوەی کۆلێرا ناگەڕێنەتەوە بۆ پیسبوونی ئاوی بیری مالآن یا ئەو بیرانەی بۆ دەرهێنانی ئاوی خواردنەوە بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە یەکێک لەو توێژینەوانە لێکۆلینەوەی لە بلآوبوونەوەی کۆلێرا لەولآتی بورتوگال کردووە لە سالی

١٩٧٤ کە بووە هۆی تووشبوونی ٢٤٦٧ کەس و مردنی ٤٨ کەس (Blake etal ,1977). لە توێژینەوەکەدا دەرکەوتووە کە ئاوی کانیاو یەکێک بووە لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە پاڵ جۆرێکی تایبەتی بوتڵی ئاوی خواردەنەوە کە لە لایەن کۆمپانیایەکی دیاریکراوەوە دروستکراوە و پابەندنەبوون بە ڕێنماییە تەندروستییەکانەوە. هەروەها لە توێژینەوەیەکی تری هاوشێوەدا، کۆمەڵێک زانیاری و دۆزینەوەی نزیک لە توێژینەوەکەی سەرەوە دۆزراوەتەوە. ئەو توێژینەوەی کە لە بەنگلادش کراوە، ئەوەی دەرخستووە کە ئاوی سەر زەوی (نەک ژێر زەوی) مەترسی گەورەتر دروستدەکات بۆ بڵاوبوونەوەی کۆلێرا (Hughes et al ,1982). بەهەمان شێوە، توێژینەوەیەکی تر کە لە پیرۆ لە ئەمریکای باشور ئەنجامدراوە دەریخستووە کە ئاوی ماڵان، بە تایبەتی ئەوانەی کە (وەکو کوردستان) تانکی سەر بانیان هەیە زۆرتر لەوانی تر تووشی کۆلێرا دەبن (Swerdlow ,1992). ئەو توێژینەوە تەنانەت ئەوەی دەرخستووە کە پیسبوونی ئاوی ماڵان لەڕێی تەنکی سەربانەوە بە بەکتیرای کۆلێرا زۆر لە پیسبوونی ئاوی بیری ماڵان زیاتر بووە.

بۆیە دەبێت ئەوە بووترێت لە باتی ئەوەی کە دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کورستان و بە تایبەتی بەڕێوەبەرایەتی ئاو بەدوای تاوانبارێکدا بگەڕێین بۆ ئەوەی بە ناهەق بەرپرسی کەن لە بڵاوبوونەوەی کۆلێرا دەبێت دوورتر لە بیرەکانی ئاو تەماشا بکەن. هەموو ئەو بەڵگانەی لێرەدا خراونەتە ڕوو و هەروەها ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی کە لە ناوچەکانی تری جیهاندا کراون، بە ڕوونی ئەوە دەردەخەن کە ئاوی سەرزەوی سەرچاوەی سەرەکی بڵاوبوونەوەی کۆلێرایە و ئاوی بیری ماڵان کاریگەریەکی ئەوتۆی نیە لەسەر بڵاوبوونەوە و تەشەنەسەندنی نەخۆشییەکە. بۆی باشتر وایە وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا پەیوەندیدارەکانی تر ئەوەندە فشار دروستبکەن کە ئاوی ماڵان بە

جۆرێک بدریت کە هیچ ماڵێک پێویستی بەوە نەبێت کە لە سەربانی ماڵەکە تەنکی ئاو هەبێت. ئەو تەنکیانە پیسییەکی زۆر کۆدەکەنەوە و دەبنە هۆی دروستبوونی مەترسی بۆ سەر سەلامەتی و تەندروستیی ئەو هاوڵاتیانەی کە لە ماڵەکانیاندا بەکاردەهێنن (وەکو زۆربەی هاوڵاتیانی کوردستان).

لە بەرامبەردا، پێ ناچێت کە وەزارەتی تەندروستیی پیسبوونی ئاوی بیری ماڵانی بە شێوەیەکی جیددی وەرگرتبێت. چونکە ئەگەر تەماشای ڕێنماییەکانی وەزارەتی تەندروستیی بکەین، ئەو ڕێنماییانە نە لە دوور و نەش لەنزیک باسی ئاوی بیری ماڵان ناکەن و ئەوەش بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وەزارەتی تەندروستییش بڕوای بە قسەکانی وەزارەتی شارەوانەی و دەزگا تایبەتەکانی ئاو نیە. بەڵام پێ دەچێت بۆ ڕازیکردنی ئەو دەزگایانە و بەرپرسەکانیان وەزارەتی تەندروستیی لەسەر زاری چەند بەرپرسێکی تەندروستیی، لەوانە وەزیری تەندروستیی، ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە ئەگەر هەیە بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بە هۆی پیسبوونی ئاوی بیری ماڵانەوە بێت.

# دەرئەنجام

ئـەم ڕاپۆرتـە هەوڵیدا تیشـکبخاتە سـەر لایەنە پزیشـکیی و تەندروسـتیی و کۆمەڵایەتـی و سیاسـیەکانی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە کوردسـتاندا. وەکـو هیواداریـن ئـەم ڕاپۆرتـە پیشـانی دابێـت، کۆلێـرا بـە تەنهـا نەخۆشـییەکی بەکتیریایـی نیـە کـە بەهـۆی کۆمەڵێـک هـۆکاری بایولۆژیـەوە سـەرهەڵدەدات و بڵاودەبێتـەوە. لەڕاسـتیدا کۆلێـرا بەهـۆی یەککگرتنـی هۆکارگەلێکـی تەندروسـتیی و سیاسـی و ئابـووری و کۆمەڵایەتیـەوە بڵاودەبێتـەوە. ئـەو کۆمەڵـە خەسـڵەتەی ئـەو وڵاتانـە کۆدەکاتـەوە کـە کۆلێرایـان تێـدا بڵاودەبێتـەوە بریتیـە لـە گەندەڵـی و نایەکسـانی و ناکارامەیـی سیاسـی و کارگێـڕی. بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە کوردستانیشـدا بۆخـۆی بەڵگەیە لەسـەر هەبوونـی گەندەڵـی و ناکارامەیـی کارگێـڕی و نایەکسـانی کۆمەڵایەتـی.

بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە کوردسـتاندا ڕووداوێکـی تـازە نیـە. لـە سـەرەتاکانی سـەدەی بیسـتەوە ئیتـر کۆلێـرا چەنـد سـاڵ جارێـک سـەریهەڵداوە و ژمارەیەکـی زۆری هاوڵاتیانـی تووشـی نەخۆشـی کـردووە و ژماریەکـی تریشـی لەوانـە کوشـتووە. وەکـو لـە گێڕانـەوە مێژوویەکانـدا دەرکـەوت، ئـەم نەخۆشـیە تەنهـا لـە کوردسـتاندا سـەرهەڵنادات و ژماریەکـی تـری وڵاتـی ناوچەکـە و جیهانیـی گرتووەتـەوە. بـەڵام بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـە کوردسـتاندا بـەو چڕیـەی کـە لـە سـەدەی بیسـتدا ڕوویانـدا و لـە حاڵـی حازریشـدا، بەڵگەیـە لەسـەر هەبوونـی کۆمەڵێـک فاکتـەر کـە پاڵنـەرن بـۆ

بڵاوبوونـەوەی پەتاکـە لـە کوردسـتاندا.

ئـەم ڕاپۆرتـە و ئـەو داتـا و توێژینەوانـەی کە خسـتیەڕوو بەڵگـەی تۆکمە دەهێنـەوە بـۆ ئـەوەی کـە پیسـبوونی سـەرچاوەکانی ئـاو هـۆکاری سـەرەکی بڵاوبوونـەوەی کۆلێرایـە لـە کوردسـتاندا. پیسـبوونی سـەرچاوەکانی ئـاو و بەتایبەتـی ئـاوی خواردنـەوەی مـاڵان لـە گۆڕانـی بـۆن و تـام و ڕەنگـی ئـاوی خواردنـەوەدا دەردەکەوێت.

ئـەو گۆڕانـەی کـە لـە ڕەنـگ و تـام و بۆنـی ئـاوی خواردنـەوەی ماڵانـدا ڕوویانـداوە، زۆربـەی جـارەکان بـە ماوەیەکـی کـورت پێـش سـەرهەڵدانی کۆلێـراوە دەرکەوتـوون. دوای ئـەو گۆڕانـەی لـە ئـاوی خواردنـەوەدا ڕوویـداوە، زۆربـەی جـارەکان پەتایەکـی تونـد سـکچوون و ڕشـانەوە دەسـتی پێکـردووە و بـە هـەزاران هاوڵاتـی لـە ئەنجامـدا ڕەوانـەی نەخۆشـخانەکان کـراون. لـە ترۆپکـی ئـەو سـکچوون و ڕشانەوەشـدا، کۆلێـرا دەرکەوتـووە و چەنـدان هاوڵاتـی کردووەتـە قوربانیـی. بۆیـە ناکرێـت پیسـبوونی سـەرچاوەکانی ئـاوی خواردنـەوەی مـاڵان پشـتگوێبخرێت وەکـو هـۆکاری سـەرەکی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا تەماشـا نەکرێـت.

لـەم ڕاپۆرتـەدا هەوڵمانـدا کـە پەنجـە بخەینـە سـەر هـۆکارە سـەرەکییەکانی پیسـبوونی ئـاوی خواردنـەوەی مـاڵان. بـەڵام دیـارە دۆزینـەوەی هـۆکارەکان پێویسـتی بـە توێژینـەوە و بەدواداچـوون و لێکۆڵینـەوەی زیاتـر هەیـە. ئـەوەی کـە زۆر بەڕوونـی لـەو بەدواداچوونـی سـەرەتاییانەدا دەردەکەوێت کـە بـۆ ئـەم ڕاپۆرتـە ئەنجامـدراوە، ئەوەیـە کـە پیسـبوونی ئـاوی دەریاچـەی دووکان سـەرچاوەی سـەرەکی بڵاوبوونـەوەی کۆلێرایـە لـە پارێـزگای سـلێمانی و بەشـێک لـە پارێـزگای کەرکـووک کـە دەریاچـەی دووکان سـەرچاوەی ئـاوی خواردنەوەیانـە. ئـەم دۆزینەوەیـە زۆر بـە ڕوونـی لـە بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا لـەو گـەڕەک و ناوچانـەدا دەردەکەوێـت

کە لە ئاوی دووکان دەخۆنەوە و و ئەو ئاوە سەرچاوەی سەرەکی ئاوی ماڵانە لەو گەڕەکاندا. پیسبوونی ئاوی دەریاچەی دووکان بەپێی دۆزینەوەکانی ئەم ڕاپۆرتە بۆ تێکەڵبوونی ئاوەڕۆی ئەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە لەگەڵ ئاوی دەریاچەکەدا کە دواتر بۆ خواردنەوە بەکاردەهێنرێت. هەروەها زنجیرە دووبارەبووەکانی وشکەساڵی و دواتر باران بارینی زۆر و لافاو، هۆکارێکی سەرەکی ترن بۆ تێکەڵبوونی ئاوی خواردنەوەوە بەو پیسایی و پاشماوانەی کە لە ناوچە کشتوکاڵیەکاندا بڵاودەبنەوە بە ئاوی خواردنەوەی دەریاچەی دوکانەوە. بەکارهێنانی مەوادی کیمیاویی و پەین و مەوادەکانی تر لە ناوچەکانی دووکان و دواتر تێکەڵبوونی ئەو مەوادانە بە ئاوی خواردنەوەوە هۆکاریکی تری بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و کۆمەڵێک نەخۆشی ترە لەو ناوچانەی کە ئاوی دووکان سەرچاوەی سەرەکیی ئاوی خواردنەوەیانە. هاوکات، ئەو توێژینەوانەی لەم ڕاپۆرتەدا خرانە ڕوو ئەوە دەردەخەن کە پێکهاتەی کیمیاویی ئاوی دووکان گۆڕاوە و بەدەرەو لەو پێوەرانەی کە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی بۆ ئاوی شیاوی خواردنەوەی دەستنیشانکردووە.

بەڵام بڵاوبوونەوەی کۆلێرا بە تەنها پەیوەندی بە پیسبوونیکی پاسیڤ و هەرلەخۆڕایی ئاوی خواردنەوە نیە. پیسبوونی ئاوی خواردنەوە لەزۆربەی وڵاتەکانی جیهان لەڕێی پشکنینی بەردەوام و چارەسەری خێرا لە لایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانی ئاو و ئاوەڕۆوەوە دەکرێت. ئەوەی ئەم ڕاپۆرتە تێبینیکرد ئەوە بووە کە سەرەڕای کۆمەڵێک بەڵگەی زەق لەسەر پیسبوونی ئاوی خواردنەوە وەکو گۆڕانی ڕەنگ و تام و بۆنی ئاوی خواردنەوەی ماڵان و هەروەها بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکانی سکچوون و کۆلێرا، بەڵام هێشتا دەزگا پەیوەندیدارەکانی تایبەت بە ئاو و ئاوەڕۆ کۆمەڵێک بیانووی نازانستیان دەهێنایەوە بۆ پیسبوونی ئاوی خواردنەوە و خۆیان لە بەرپرسیارێتی دەدزیەوە. زۆربەی

چارەکان و بەپێی ئەو بەڵگانەی کە لەم ڕاپۆرتەدا بڵاوکراوەتەوە، دەزگا جیاجیاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ناکۆکبوون لەسەر ئەوەی کە هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا چییە. بۆ نموونە لە کاتێکدا کە دەزگا تەندروستییەکان جەختیان لەسەر پیسبوونی ئاوی خواردنەوە دەکرد، دەزگاکانی تایبەت بە ئاو و ئاوەڕۆ ئەو لێدوانانەی بەرپرسە تەندروستییەکانیان ڕەتدەکردەوە و لێدوانی پێچەوانەیان دەدا لەسەر ئەوەی کە ئاوی خواردنەوە هیچ کێشەیەکی نیە و گۆڕانکارییەکانی ڕەنگ و تام و بۆنی ئاوی خواردنەوە تەنها بەهۆی وەکو خۆیان دەیانگوت کۆمەڵێک گۆڕانکاری (فیزیکی) بووە بەهۆی قەوزەوە... هتد. بۆیە دەکرێت ئەوە بڵێین کە یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا نەبوونی هەماهەنگی و تێگەیشتنە لە نێوان دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە تایبەتی دەزگا تەندروستییەکان و دەزگاکانی تری تایبەت بە ئاو و ئاوەڕۆوە.

لە نەبوونی هەماهەنگی گرنگتریش، نەبوونی هەستکردن بووە بە بەرپرسیارێتی لەلایەن دەزگاکانی ئاو و ئاوەڕۆوە لەمەڕ پیسبوون ئاوی خواردنەوە و تێکچوونی بۆرییەکانی گواستنەوەی ئاو و کەمبوونی ئاوی ماڵان و بەکارهێنانی تانکی سەربان بۆ دابینکردنی ئاوی خواردنەوە. ئەوەی جێگای سەرەنجە ئەوەیە کە بە ماوەیەکی کەم پێش بڵاوبوونەوەی کۆلێرا ئاوی ماڵانی چەند گەڕەکێک کەمیکردوو و ئەوەش بووە هۆی سەرهەڵدانی ناڕەزاییەتی و خۆپیشاندان و گرتنی ڕێگا سەرەکییەکان... هتد. بەڵام هەموو ئەمانە پاڵی بە دەزگا پەیوەندیدارەکانەوە نەنا کە چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکانی کەمیی ئاو بنێن و کۆتایی بەو دۆخە بهێنن. بۆیە دەکرێت بڵێین کە کۆلێرا دەرئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو بێباکیی و ناکارامیەی دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندییان بە ئاوی خواردنەوە هەیە لە

دابینکردنی ئاوی پاک و خاوێنی خواردنەوە بۆ مالآن و ناچارنەکردنی ئەو مالآنە بۆ کۆکردنەوە و عەمبارکردنی ئاوی خواردنەوە لە تەنکی سەربانەدا کە سەرچاوەیەکی سەرەکی نەخۆشیە و بەهۆی کۆبوونەوەی ئاو لەو تەنکیانەدا بۆ ماوەیەکی درێژ، بەکتیریا و ڤایرۆس و بوونەوەرە زەرەرمەندەکانی تر گەشەدەکەن و دەبنە هۆی بلآوبوونەوەی نەخۆشیی.

یەکێک لەو دەزگا پەیوەندیدارانەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە بە گوێرەی دۆزینەوەکانی ئەم راپۆرتە شکستێکی گەورەی هێناوە لە رووبەڕووبوونەوە و بنبڕکردن و رێگەگرتن لە بلآوبوونەوەی کۆلێرا، وەزارەتی تەندروستییە. ئەم وەزارەتە دەزگایەکە کە راستەوخۆ پەیوەندیدارە بە کێشە تەندروستییەکانەوە و تاوانباری سەرەکییە لە بلآوبوونەوەی نەخۆشی و پەتایەکی ترسناکی وەکو کۆلێرا کە تەنها لە وڵاتە دواکەوتووەکانی ئەفریقیادا بلآودەبێتەوە. وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان شکستی هێناوە لەوەی کە تەندروستیی کۆمەڵگای کوردستان بپارێزێت و چاودێرێکی جیددی بێت بەسەر تەندروستیی هاونیشتیمانیانەوە. ئەم وەزارەتە وەکو لە بەڵگەکانی ئەم نامێلکەیەدا دەردەکەوێت، نەک کاری لەسەر هۆکارە سەرەکییەکانی بلآوبوونەوەی کۆلێرا نەکردووە بەڵکو هاوکات شکستی هێناوە لەوەی کە زانیاری و داتا و ژمارەی تۆکمە بلآوبکاتەوە بەشێوەیەکی خێرا بۆ ئەوەی کە سوودی لێوەربگیرێت و لە کاتێکی کەمدا رێگە لە بلآوبوونەوەی هەرچی زیاتری نەخۆشیەکە هەیە بگیرێت. بۆ نموونەوە وەکو لە چەند شوێنێکی ئەم نامێلکەیەدا ئاماژەمان پێداوە، وەزارەتی تەندروستیی سەردانی هەزاران هاوڵاتی بۆ دەزگا تەندروستییەکان بەهۆی سکچوون و رشانەوەوە وەکو بەڵگەیەک هێناوەتەوە بۆ باشی سیستەمی تەندروستیی و وەکو خۆی دەڵێت بەڵگەیە لەسەر توانای دەزگا تەندروستییەکان بۆ پێشوازیکردن لەو ژمارە زۆرەی هاوڵاتیان،

بەڵام پرسیاری ئەوەی نەکردووە کە ئاخۆ هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیە چیە و هۆکاری تووشبوونی ئەو ژمارە زۆری هاوڵاتیان بە سکجوون و ڕشانەوە چیە. بۆیە دەشێت بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە وەزارەتی تەندروستیی لەمەڕ کێشەی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و لە زۆر نموونەی تریشدا، ئەوەندەی لە خەمی ناوبانگی خۆی و دەزگا تەندروستییەکان بووە، ئەوەندە لە خەمی تەندروستیی و ساغیی هاوڵاتیان نەبووە.

لە لایەکی ترەوە، بڵاوبوونەوەی نەخۆشیگەلێکی وەکو کۆلێرا و سکچوون و ڕشانەوە بۆخۆیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە وەزارەتی تەندروستیی گرنگی بە کۆمەڵێک خزمەتی بنەڕەتیی و گشتی نادات و زۆربەی هەوڵ و داهات و تواناکانی بۆ کۆمەڵێک خزمەتی پزیشکیی ورد تەرخانکردووە. بۆ نموونە وەزارەتی تەندروستیی گرنگیەکی ئەوتۆ نادات بە بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی تەندروستیی و جێبجێکردنی بنەما سەرەتاییەکانی پاکوخاوێنی و گرنگیدان بە هەماهەنگی لەگەڵ دەزگا پەیوەندیدارەکان بۆ گەرەنتیکردنی پاکیی ئاوی خواردنەوە و پاکی چێشخانە و شوێنەگشتیەکان. هۆکاری سەرەکی ئەم گرینگینەدانەش ئەوەیە کە وەزارەتی تەندروستیی لە لایەن کۆمەڵێک پزیشکی پسپۆری بوارەکانی هەناو و نەشتەگەرییەوە حکومڕانی دەکرێت و ئەو پزیشکە بەڕێزانە یا زانیاریان لەسەر تەندروستیی کۆمەڵ و سیاسەتی تەندروستیی نیە یاخود بۆ بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیان گرنگی زیاتر بە بوارەووردەکانی نەشتەرگەری و هەناو دەدەن (کە خۆیان پسپۆرییان تێدا هەیە) و کەمتر گرنگی بە کێشە گشتیەکان و ئەو کێشانە دەدەن کە ڕووبەڕووی کۆی کۆمەڵگا دەبێتەوە.

ئەو فاکتەرانەی سەرەوە لە شکستی وەزارەتی تەندروستیی بۆ

ڕووبەڕووبوونـــەوەی کۆلێـــرادا ڕەنگیداوەتـــەوە . لـــە کاتێکـــدا کـــە ڕێکخـــراوە تەندروســـتییە ناســـراوەکان وەکـــو ڕێکخـــراوی تەندروســـتیی جیهانیـــی ئامۆژگاری تەرخانکردنـی شـوێنی تایبـەت بـە کۆکردنـەوە و چاودێریکردنـی نەخۆشـەکانی کۆلێـرا دەکات، وەزارەتـی تەندروسـتیی بـە پێچەوانـەی ئـەو ڕێنمایانـەی کـردووە و شکسـتی هێنـاوە لـە پابەندبـوون بـەو ڕێنمایانـە . زۆربـەی شـارەزاییان ئامـاژە بـەوە دەکـەن کـە پێویسـتە نزیـک لـەو گەڕەکانـەی کـە کۆلێـرای تێـدا بڵاوبێتـەوە شـوێن و کابینـە و تەنانـەت چـادری تایبـەت بـۆ چارەسـەرکردنی نەخـۆش دابینبکرێـت. ئـەم شـوێنە تایبەتانـە تەنهـا سـوودی ئەوەیـان نیـە کـە نزیکـن لـە شـوێنی بڵاوبوونـەوەی پەتاکـە و کات و پـارە بـۆ هاوڵاتیـان دەگێڕنـەوە بـۆ ئـەوەی نەچـن بـۆ نەخۆشـانەکان، بەڵکـو هـاوکات لـە کاتـی تووشـبوونی ژمارەیەکـی زۆری هاوڵاتیـان بـە پەتاکـە کەمتریـن جێـگا لـە نەخۆشـخانەکاندا دەگیرێـت. ئـەوەی وەزارەتـی تەندروسـتیی کـردی لەکاتـی بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرادا لـە پارێـزگای سـلێمانی بریتیبـوو لـە چۆڵکردنـی چەنـد قاوشـێکی نەخۆشـخانەکان بـۆ ئـەوەی نەخۆشـی تێـدا بخەوێنرێـت. ئـەم هەنـگاوە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە ئـەو خزمەتانـەی کـە لـەو قاوشـانە پێشکەشـدەکرا پەکیـان بکەوێـت و بووەسـتێنرێن، هەروەهـا ئەگـەری بڵاوبوونـەوەی کۆلێـرا بـۆ نەخۆشـەکانی تریشـی زیادکـرد کـە لـە نەخۆشـخانەکاندا بەهـۆی کێشـەی تـرەوە خەوێنرابـوون.

جگـە لـەو کێشـانەی سـەرەوە، شـێوازەکانی دەستنیشـانکردن و کۆنترۆڵکردنـی کۆلێـرا لـە لایـەن وەزارەتـی تەندروسـتییەوە کۆمەڵێـک شـێواز و میکانیزمـی کـۆن و مـاوە بەسـەرچوون و ناکرێـت بـەو ئامرازانـەوە ڕێگـە لـە پەتـا و نەخۆشـیەکی ترسـناکی وەکـو کۆلێـرا بگیرێـت. لـە حاڵـی حـازردا میکانیزمـی خێـرا هەیـە بـۆ دەستنیشـانکردنی کۆلێـرا و دەکرێـت لـە بنکـە تەندروسـتییەکاندا بەکاربهێنرێـت و بـە خێراتریـن شـێوە کۆلێـرا

دەستنیشانبکرێت. بەڵام وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان، پێویستی بەوە هەبوو کە نموونەکان ڕەوانەی بەغدا و تەنانەت ڕەوانەی قاهیرەی پایتەختی میسر بکات بۆ دڵنیابوون لە بڵاوبوونەوەی کۆلێرا. ئەم دواکەوتنە لە دەستنیشانکردنی پەتاکە بووە هۆی دواکەوتنی چارەسەر و لە دەرئەنجامدا تووشبوونی ژمارەیەکی زۆرتری هاوڵاتیان و تەنانەت مردنی ژمارەیەکی زیاتریش. هاوکات لەگەڵ دواکەوتووی شێواز و میکانیزمەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە، وەزارەتی تەندروستیی شکستیهێناوە لەوەی کە سوود لە ئامراز و میکانیزمە سەردەمییەکانی بەرگەریکردن لە بەڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە بکات. بۆ نموونە لە کوردستاندا سوود لە کوتان دژی کۆلێرا نابینرێت لە کاتێکدا کە جۆر و شێوازی تازە کوتان لە جیهاندا لە حاڵی حازر بڵاوبووەتەوە و کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە لەسەر کەمکردنەوە و ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی پەتاکە.

لە کۆتاییشدا، میکانیزمەکانی چارەسەرکردنی کۆلێرا هەرچەندە ئاسان و سادەن و خۆیان لە دابینکردنی ئاوی مغذی و لە هەندێک حاڵەتی دیاریکراودا بەکارهێنانی ئەنتیبایوتێک دەبینێتەوە، بەڵام ئەو بوارەش لە کێشە و کەموکورتی بەدەر نیە. یەکێک لەو فاکتەرە مەترسیدارانەی کە دەشێت ڕۆڵێیان هەبێت لە بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و ئاسان نەبوونی کۆنترۆڵکردنی پەتاکە و نەخۆشییەکە و بنبڕکردنی، بریتییە لە بەکارهێنانی لەڕادەبەدەر و نازانستیانە و کوێرانەی دەرمان و ئەنتیباویتیک لە کوردستاندا. ئەوەی لە حاڵی حازردا بووە بە کێشەیەکی جیهانیی خەترناک سەرهەڵدانی بەرگەریی بەکتیریا و ڤایرۆسە بۆ ئەو دەرمان و ئەنتیبایۆتیکانەی کە بەکاردەهێنرێت. ئەم کێشە خەترناکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆر جار دەرمان بە بێ هەبوونی پێویستی بەکاردەهێنرێت و تەنها بۆ ڕازیکردنی دڵی

نەخۆشەکە و خانەوادەکەی دەنووسرێت. هەروەها هۆکارێکی تر بریتیە لە بەکارهێنانی دەرمانی کوالێتی نزم یا ساختە یا ماوە بەسەرچوو. هەموو ئەم فاکتەرانە وا دەکەن کە کۆمەڵە بەکتیریایەک دروستبن کە پێیاندەوترێت (سوپەربەکتیریا) و هیچ دەرمانێک و ئەنتیبایوتیکێک کاریان تێ ناکات. دوور نیە لە کوردستاندا ئەم جۆرە بەکتیریایە دروستنەبووبیت بەهۆی کۆڵەواریی و خراپی باری دەرمان و بەکارهێنانی دەرمانی ماوەبەسەرچوو و کوالێتی نزم و ساختە لە هەرێمەکەدا.

# ڕاسپاردە

دەکرێت بەم کۆمەڵە ڕاسپاردەوە کۆتایی بە نامێلکەکە بهێنین.

✓ دروستکردنی کۆمیتەیەکی تایبەت بە لێکۆڵینەوە لە پەتای کۆلێرا لە کوردستاندا و خۆئامادەکردن و کۆنترۆلکردنی و پاراستن لە پەتای داهاتوو.

✓ چاوخشاندنێکی زانستیانەی گشتگیر بە سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوەی ئەو شوێنانەی کە کۆلێرایی تێدا سەریهەڵداوە بە تایبەتی ئەو ناوچانەی کە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەیان لە دەریاچەی دووکانەوە وەردەگرن.

✓ هەماهەنگی زیاتر لە نێوان وەزارەتی تەندروستیی و دەزگا پەیوەندیدارەکانی تر بە تایبەتی ئاو و ئاوەڕۆ و وەزارەتی شارەوانی بۆ دارشتنی پلانی ستراتیژی بۆ ڕیگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی پەتای کۆلێرا لە داهاتوودا.

✓ باشترکردنی سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوە و پێدانی ئاو بە ماڵان بە جۆرێک کە ئەو ماڵانە چیتر پێویستیان بە تەنکی سەربان بۆ کۆکردنەوەی ئاوی خواردنەوە نەمێنێت.

✓ ڕاگەیاندنی حاڵەتی ئامادەباشی لە کاتی گۆڕانی ڕەنگ و بۆن و تامی ئاوی خواردنەوەی ماڵان.

✓ ڕاگەیاندنی حاڵەتی ئامادەباشی لە کاتی تووشبوونی ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان بە سکچوون و ڕشانەوە

✓ بڵاوکردنەوەی زانیاری و داتا و ژمارەی تۆکمە و زانستی لە کاتی گومانی بڵاوبوونەوەی پەتای کۆلێرا و بەکارهێنانی ئەو داتا و ژمارانە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ دەستنیشانکردنی هۆکار ودیاریکردنی میکانیزمەکان کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکە.

✓ دروستکردنی سەندوقێکی تایبەت بۆ تەرخانکردنی داهات بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر کۆلێرا و هەوڵدان بۆ دەستنیشاناکردنی هۆکارەکان و دیاریکردنی ڕێگاکانی چارەسەر.

✓ هاوردەکردنی میکانیزم و پشکنینە سەردەمیەکان بۆ دەستنیشانکردنی خێرای کۆلێرا لەوانەی کە گومانی تووشبوونیان بە نەخۆشیەکە دەکرێت.

✓ هاوردەکردنی کوتانی شیاو بۆ کۆلێرا و پێشکەشکردنی کوتانەکە بەپێی ڕێنمایی و ڕاسپاردەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی.

✓ دابینکردنی شوێنی تایبەت بەوانەی کە تووشی نەخۆشیەکە دەبن لە کاتی بڵاوبوونەوەی پەتاکە و پەنا نەبردن بۆ قاوشەکانی هەنا و نەشتەرگەری لە نەخۆشخانە گشتیەکاندا.

✓ کۆتایی هێنان بە بەکارهێنانی نازانستی و هەڕەمەکی دەرمان و ئەنتیبایوتیک لە بنکە تەندروستیی و نەخۆشخانەکان و عیادەکانی لاکۆڵاندا.

✓ ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر ئامادەباشی بەکتیریاکە بۆ ئەو دەرمانانەی کە بۆی بەکاردەهێنرێت و دڵنیابوون لە سەرهەڵنەدانی بەرگەری لە لایەن بەکتیریاکەوە بۆ ئەو دەرمانانە.

✓ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری تەندروستیی لە ناو هاوڵاتیاندا و هاندانیان بۆ پابەندبوون بە پرنسیپەکانی پاکوخاوێنی و دەستشوشتن.

✓ چاودێریکردنی توند و وردی چێشتخانە و شوێنە گشتیەکان و دڵنیابوون لە پاکوخاوێنی ئەو خواردن و خواردەمەنیانەی پێشکەشیان دەکەن.

✓ گۆڕینی شێوازی لەناوبردنی پاشماوە و ئاوەڕۆ لەو ناوچانەی کە گومانی ئەوەیان لێدەکرێت کە سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی کۆلێران وەکو ناوەچەی گەشتیاریی دووکان.. هتد.

✓ گەڕان بەدوای سەرچاوەکانی تێکەڵبوونی ئاوی خواردنەوە بە ئاوەڕۆکان و چارەسەرکردنی ئەو کێشانە.

✓ بەدواداچوونی زانستی بۆ گۆڕانی پێوەرەکانی شیاویی ئاوی خواردنەوە (کلۆر، ڕەقیی، گەیاندنی کارەبا، ڕێژەکانی خوێ... هتد) و دڵنیابوون لە شیاوی ئاوی خواردنەوە بۆ بەکارهێنانی مرۆیی.

✓ قەدەغەکردنی خواردنەوەی ئاوی ماڵان ئەگەر هاتوو هەر گۆڕانکارییەک لە ڕەنگ و بۆن و تامی ئاوەکە ڕوویدا.

✓ دروستکردنی تیمی هەماهەنگی ناوچەیی و نێودەوڵەتی بۆ سوودوەرگرتن لە ئەزموونی وڵاتانی جیهان، بە تایبەتی ئەوانەی کە کۆلێرایان تێیدا بڵاودەبێتەوە، بۆ فێربوون لە ئەزموونی ئەو وڵاتانە و بەکارهێنانیان بۆ بنبڕکردنی پەتاکە لە کوردستاندا.

# سەرچاوەکان

AbdulHameed ،M.et al.(2009).APPLICATION OF WATER QUALITY INDEX FOR ASSESSMENT OF DOKAN LAKE ECOSYSTEM KURDISTAN REGION IRAQ.pdf798–792 ،.

Abdulwahid ،S.(2013).water quality index of delizhiyan Springs and Shawraw river within Soran district Erbil Kurdistan. pdf.Journal of Applied Environmental and Biological Sciences، 48–40 ،(1)3.

Ahmed.(2012).determination of water quality index for qalyasan stream in sulaimani city kurdistan region of Iraq.pdf.International Journal of Plant ،Animal and Environmental Sciences157–148 ،(4)2 ،.

Al-Khoei ،H. ،& Al-Wardi ،A.(2010).Social Glimpses of Modern Iraqi History: Volume 1: The Ottomans ،Safavids and Mamluks (p.132).LAP LAMBERT Academic Publishing.Retrieved from http://www.amazon.co.uk/Social-Glimpses-Mod-

ern-Iraqi-History/dp/3838380282

(Awene.2012a). بۆ دڵنیابوون، پشکنینی پەتاو سکچونەکەی سلێمانی رەوانەی بەغدا دەکرێت | ئاوێنە نیوز.

Retrieved February 24 ،2013 ،from http://www.awene.com/article/%D8%A8%DB%86-%D8%AF%DA%B5%D9%86%DB%8C%D8%A7%D8%A8%D9%88%D9%88%D9%86%D8%8C-%D9%BE%D8%B4%D9%83%D9%86%DB%8C%D9%86%DB%8C-%D9%BE%D9%87%E2%80%8C%D8%AA%D8%A7%D9%88-%D8%B3%D9%83%DA%86%D9%88%D9%86%D9%87%E2%80%8C%D9%83%D9%87%E2%80%8C%DB%8C%E2%80%8C-%D8%B3%D9%84%DB%8E%D9%85%D8%A7%D9%86%DB%8C-%D8%B1%D9%87%E2%80%8C%D9%88%D8%A7%D9%86%D9%87%E2%80%8C%DB%8C%E2%80%8C-%D8%A8%D9%87%E2%80%8C%D8%BA%D8%AF%D8%A7-%D8%AF%D9%87%E2%80%8C%D9%83%D8%B1%DB%8E%D8%AA

(Awene.2012). بەڕێوەبەرایەتی ئاو: ترسی زەردبونی ئاوی سلێمانیتان نەبێت. Retrieved from http://www.awene.com/article/بەڕێوەبەرایەتی-ئاو-ترسی-زەردبونی-ئاوی-سلێمانیتان-نەبێت

(Awene.2012b).سلێمانی: لە بێ ئاویدا خۆپیشاندان دەستی پێکرد | ئاوێنە نیوز.

Retrieved February 21 ،2013 ،from http://

www.awene.com/article/%D8%B3%D9%84%D-B%8E%D9%85%D8%A7%D9%86%D-B%8C-%D9%84%D9%87%E2%80%8C-%D8%A8%D-B%8E-%D8%A6%D8%A7%D9%88%D-B%8C%D8%AF%D8%A7-%D8%AE%D-B%86%D9%BE%DB%8C%D8%B4%D8%A7-%D9%86%D8%AF%D8%A7%D9%86-%D8%AF%D9%87%E2%80%8C%D8%B3%D8%AA%DB%8C-%D9%BE%DB%8E%D9%83%D8%B1%D8%AF

Azizi MH ،A.F.(2009).history of cholera in Iran.pdf.History of Medicine55–51 ،(1)2 ،.

Barua ،D. ،& Greenough ،W.B.(1992).Cholera (Google eBook) (p.372).Springer.Retrieved from http://books.google.com/books?hl=en&lr=&id=HRwGkfyNv6AC&pgis=1

Bhishagratna.(1907).An English translation of the Sushruta samhita،.Retrieved March 3 ،2013 ،from http://archive.org/details/englishtranslati00susruoft

Blake etal.(1977).cholera in portugal 1974.American Journal of Epidemiology343–337 ،(4)105 ،.

(Cawder.2012). دەربارەی گۆڕانی ڕەنگی ئاوی خواردنەوەی شاری سلێمانی.

cawder.Retrieved from http://www.cawder.org/yeke.php?besh=Nusraw&perrge=nusraw&nujimare=21593

(civilmagazine.2012).هاووڵاتیان ترسیان لێنیشتووە ...

سەرچاوەکانی ئاوی شاری سلێمانی زەرد دەبن.

civil magazine.Retrieved from http://www.civilmag.com/?p=3271

Colwell ،R.R.(1996 ،December 20).Global climate and infectious disease: the cholera paradigm.Science (New York، N.Y.).Retrieved from http://www.pubmedcentral.nih.gov/articlerender.fcgi?artid=126864&tool=pmcentrez&rendertype=abstract

Dick ،M. ،Guillerm ،M. ،Moussy ،F. ،& Chaignat ،C.-L. (2012).Review of Two Decades of Cholera Diagnostics-How Far Have We Really Come? PloS Neglected Tropical Diseases، 10)6).

Durana ،C.(1994).Socioeconomic Impact and Gender Differentials of Cholera.

(Galikurdistan. 2012).سەرچاوەی ئاوی سلێمانی پاکە .

Retrieved from http://www.gksat.tv/Default.aspx?page=article&id=7696&l=3

Glass et al.(1982).ENDEMIC CHOLERA IN RURAL BANGLADESH1980–1966 ،.American Journal of Epidemiology970–959 ،(6)116 ،.

(Golan. 2012).گولان میدیا - وەزیری تەندروستیی کۆنترۆڵکردنی پەتای کۆلێرا رادەگەیەنێت.

Retrieved February 23 ،2013 ،from http://gulan-media.

com/t_detail.php?section=1&id=10023

Guardian.(2012).Haiti seeks $2bn to fight cholera outbreak blamed on UN soldiers | World news | guardian.co.uk.Retrieved March 3 ،2013 ،from http://www.guardian.co.uk/world/2012/nov/29/haiti-cholera-plan-un

Harrison.(2012).Harrison's Principles of Internal Medicine، 18th Edition Textbook.Retrieved March 3 ،2013 ،from http://www.harrisonsim.com/

(Hawler. 2012).پارێزگای هەولێر |وەزارەتی تەندروستیی خواردنەوەی ئـاوی قوتابخانەکانـی قەدەغـە کرد'>ئاوی قوتابخانەکان پیسـە".

Retrieved February 25 ،2013 ،from http://www.hawlergov.org/ku/article.php?id=1349940421

Hughes ،J.M. ،Boyce ،J.M. ،Levine ،R.J. ،Khan ،M. ،Aziz، K.M. ،Huq ،M.I. ،& Curlin ،G.T.(1982 ،January).Epidemiology of eltor cholera in rural Bangladesh: importance of surface water in transmission.Bulletin of the World Health Organization.Retrieved from http://www.pubmedcentral.nih.gov/articlerender.fcgi?artid=2535992&tool=pmcentrez&rendertype=abstract

Khwaif ،J.M. ،Hayyawi ،a H. ،& Yousif ،T.I.(2010 ،June).Cholera outbreak in Baghdad in 2007: an epidemiological study. Eastern Mediterranean health journal = La revue de santé de la Méditerranée orientale = al-Majallah al-ṣiḥḥīyah li-sharq al-mutawassiṭ.Retrieved from http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/20799583

Kirigia ،J. ،Sambo ،L. ،Yokouide ،A. ،Alley ،E. ،Muthuri ،L.، & Kirigia ،D.(2009).Economic burden of chlera in the WHO African region.BMC International Health and Human Rights8)9 ،).

KITTS ،J.A. ،Roberts ،J.H. ،& Canada ،I.D.R.C.(1996). The Health Gap: Beyond Pregnancy and Reproduction (p.235). IDRC.Retrieved from http://books.google.com/books?hl=en&lr=&id=VHfkYiK-_SkC&pgis=1

(KRG. 2012). وەزارەتــی تەندروستیی چەنـد رێنمایەکـی پێویسـت بـۆ خۆپاراسـتن لـە نەخۆشـی کۆلێـرا بـەڵاو دەکاتـەوە.

Retrieved March 2 ،2013 ،from http://www.krg.org/a/d.aspx?s=01010200&l=13&r=26&a=45438&s=010000

(H.2012 ،Kurdi). ئاگاداری ئاوی خواردنەوە پیس بووە سلێمانی.

Retrieved from http://www.youtube.com/watch?v=1AB-2P09D-BQ

(Kurdistan Nwe. 2011). گەندەڵییەکانی دیوانی پارێزگای سلێمانی.

(Kurdistan Parliament. 2007). یاسـای وەزارەتـی تەندروسـتیی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان.

Retrieved March 2 ،2013 ،from http://www.kurdistan-parliament.org/files/articles/101207014109.pdf

(KurdistanNwe. 2012). سـلێمانی..تا ئەمـڕۆ ٥٣ حاڵەتـی کۆلێـرا تۆمارکـراوە.

Retrieved from http://www.kurdsat.tv/hewal.php?id=5233&cor=kurdistani

(Kurdiu. 2012). ڤیدیۆ..ڕێنمایی بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی کۆلێرا ببینە.

Retrieved February 22 ،2013 ،from http://www.kurdiu.org/hawal/index.php?pageid=110881

(Kurdsat. 2012a). سلێمانی..توشبوان بەپاتای کۆلێرا بەرێژەی ٣٠٪ کەمدەکات.

Retrieved February 22 ،2013 ،from http://www.kurdsat.tv/hewal.php?id=5331&cor=kurdistani

(Kurdsat. 2012b).لیژنەیەکی باڵا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پەتای کۆلێرا لە هەرێمی کوردستان پێکدەهێنرێت.

Retrieved March 2 ،2013 ،from http://www.kurdsat.tv/hewal.php?id=5192&cor=kurdistani

Lacey.(1995).Cholera Calamitous Past ،Ominous Future. Clinical Infectious Diseases1419–1409 ،(5)20 ،.

Macpherson.(1884).Annals of cholera; from the earliest periods to the year 1817.Retrieved March 3 ،2013 ،from http://archive.org/details/annalsofcholera00macp

Museum of Science.(2013).Microscope Lab - Wet Mounts. Retrieved April 20 ،2013 ،from http://legacy.mos.org/sln/sem/wetmount.html

(Niqash. 2012).سلێمانی شەڕی لەگەڵ کۆلێرا دەست پێکردەوە.

Niqash.Retrieved from http://www.niqash.org/articles/?id=3139&lang=ku

Parliament ،E.(2007).Debates - Thursday27 ، September 2007 - Annex.Retrieved February 21 ،2013 ،from http://www.europarl.europa.eu/sides/getDoc.do?pubRef=-//EP//TEXT+CRE+20070927+ANN-01+DOC+XML+V0//EN&language=EN

(Peyamner. 2012). وەزیــری تەندروســتیی: لەسـلێمانی ڕێــژەی نەخۆشــی ســکچوو لەبەرزبوونــەوە دایــە.

Retrieved February 24 ،2013 ،from http://www.peyamner.com/PNAnews.aspx?ID=290071

Sargaonkar ،A. ،& Deshpande ،V.(2003 ،November).Development of an overall index of pollution for surface water based on a general classification scheme in Indian context.Environmental monitoring and assessment.Retrieved from http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/14609274

(Sbeiy. 2012). تەندروســتیی ســلێمانی: شــەش حاڵەتــی گومانــاوی نەخۆشــی کۆلێــرا هەیــە.

Retrieved February 22 ،2013 ،from http://sbeiy.com/Detail.aspx?id=11969&LinkID=4

Singh et al.(1995).epidemiology of cholera in Delhi.pdf،41 ، 142–139.

Swartz ،T.a.(1972 ،May).Recent Israeli experience with cholera.Proceedings of the Royal Society of Medicine.Retrieved from http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/16258325

Swerdlow.(1992).waterborne tranmission of epidemic chol-

era in trujillow peru lessons for a continent at risk.pdf.The Lancet32–24 ،340 ،.

Trondalen ،J.(2009).Climate Changes ،Water Security and Possible Remedies for the Middle East.

WHO.(1970).Principles and Practice of Cholera Control.Geneva.

WHO.(2003a).Cholera in Iraq - Update 2.Retrieved from http://www.who.int/csr/don/2003_05_14/en/index.html

WHO.(2003b).Cholera in Iraq - Update.Retrieved from http://www.who.int/csr/don/2003_05_13a/en/index.html

WHO.(2007a).Cholera in Iraq.Retrieved from http://www.who.int/csr/don/2007_09_10a/en/index.html

WHO.(2007b).Cholera in Iraq - update.Retrieved from http://www.who.int/csr/don/2007_09_14/en/index.html

WHO.(2007c).Cholera in Iraq - update 2.Retrieved from http://www.who.int/csr/don/2007_09_25/en/index.html

WHO.(2010).IraqCountryProfile2010.Retrieved February 14 ،2013 ،from http://www.who.int/cholera/countries/IraqCountryProfile2010.pdf

WHO.(2012).Cholera in Iraq 2012.

WHO.(2013a).WHO | World Health Organization.Retrieved from http://www.who.int/gho/epidemic_diseases/cholera/en/index.html

WHO.(2013b).WHO | Cholera.Retrieved from http://www.who.int/topics/cholera/en/

WHO.(2013c).WHO | Prevention and control of cholera outbreaks: WHO policy and recommendations.World Health Organization.Retrieved February 26 ،2013 ،from http://www.who.int/cholera/prevention_control/recommendations/en/index.html

Wikipedia.(2013).Pandemic - Wikipedia ،the free encyclopedia.Retrieved March 3 ،2013 ،from http://en.wikipedia.org/wiki/Pandemic

(Xendan. 2012). سلێمانی: مانگی تەموز زۆرترین نەخۆشی سکچوونو رشانەوە داخلّی نەخۆشخانە کراون.

Retrieved February 22 ،2013 ،from http://xendan.org/dreja.aspx?=hewal&jmara=43040&Jor=1

پێشمەرگە، و. (٢٠١١).گرفتی تێکەڵبوونی ئاوەرۆی دوکان و سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی سلێمانی و کەرکوک چارەسەر دەکرێت.

Retrieved March 17 ،2013 ،from http://www.jingeykurdistan.com/website/index.php?option=com_content&view=article&id=525:2011-12-10-09-01-10&catid=115:2010-08-05-06-50-17&Itemid=241

نوێ، ک. (٢٠١١).ئاوی خواردنەوەی سلێمانی و چەمچەماڵ و بازیان و تەکیەو شۆڕش مەترسی نەماوە.

Retrieved March 17 ،2013 ،from http://www.knwe.org/DirejeHewal.aspx?Cor=1&Besh=Hewal&Jimare=3234